ناوی کتێب:فەزڵی زانستی شەرعی و پێگەی زانایان لەدیندا

نوسینی: کاروان کەمال الكردي

نۆرە و ساڵی چاپ: یەکەم - ١٤٤٤ کۆچی – ٢٠٢٣ زاینی

ژمارەی سپاردن: ژمارە ( ) ی ساڵی ٢٠٢٣ پێدراوە.

تیراژ: ١٠٠٠ دانە

# پێشەکی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين وصلى الله على نبينا محمد الأمين وعلى آل و أصحابه ومن تبعهم بإحسان إلى يوم الدين، أما بعد:

**دەرگایەك بۆ ناساندنی کتێب و پاڵنەری نووسینی:**

ئێستا کە ئێمە لەسەر دەمی نەزانی و نەمانی زانست داین، بەپێی واقع و فەرموودەکانی پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم-، دوای ئەوەی کۆمەڵێك لە فێرخوازی زانستی شەرعی داوایان کرد کەوا پێویستە دووبارە جارێکی تر پلەو پایەو گەورەیی علم بۆ خەڵك بەیان بکرێتەوە، چونکە کەسانێک کە لەوپەڕی نەزانی و گومرایی ڕۆچوون، ئاوڕ بەلای زانست نادەنەوە وە خەڵکی لە زانست سارد دەکەنەوە وە کتێبەکان فڕێ دەدەن، وە هیچ ڕێزێک بۆ پێشەوایانی سەلەفی ئوممەت دانانێن و دەڵێن: ئەوان مردن و ڕۆیشتن، دین لەوان وەرناگیرێت!!

هەروەها سەلماندنی ئەوەی کەوا ( واجبە ) بەبەڵگە و ئیجماعی زانایان ( فێربوونی زانستی شەرعی ) بەتایبەت مەسائیلی عەقیدە و حەڵاڵ و حەرام.

هەروەها ئامانج لەو کتێبە دووبارە گەڕانەوەی پێگەو گەورەیی زانستە بۆ خوێنەر، چونکە بەزانینی گەورەیی و گرنگی زانست دەبێتە هاندەرێک بۆ ئەوەی موسڵمان زیاتر و زۆرتر هەوڵی ئەوە بدات خۆی لە دین شارەزا بکات، وە تێدەگات لەوەی ئەوەی ئەو دەیکات جیهادە و لای

سەلەف لە نوێژی سوونەت گەورەتر بووە وە هەندێك وەك نوێژ مامەڵەیان لەگەڵ کردووە، دواتر بەووردی باسیان دەکەین ان شاء الله.

ئێمەش بەیارمەتی الله -عز وجل- بەو کەمە زانستەی کەوا الله پێی بەخشیوین دەستمان پێکرد و کۆمان کردەوە و نوسیمان، بەجۆرێک کەوا لە ( خوێنەری بەڕێز ) بکەین هەرکاتێ ئەم کتێبەی خوێندەوە هێندە تامەزرۆ بێت بۆ علم ئامادە بێ خۆی (زیندانی) بکات لە ماڵ و پشت لە خۆشیە فریودەرەکانی سەردەم بکات، وە بەهەموو شێوەیەك هەوڵی فێربوون و خۆ شارەزا کردن بدات لەدین دا بإذن الله.

الله عزوجل لە قورئان بە پێغەمبەر -صلى الله عليه وسلم- دەفەرمووێت: ( وَقُل رَّبِّ زِدْنِي عِلْمًا ) طه- ١١٤. واتە: بڵێ: ئەی پەروەردگارم! زانست و زانیاریم زیادبکە. ئەو ئایەتە بەسە بۆ تۆی خوێنەر کەوا تێبگەی بۆچی لەهەموو قورئاندا الله تعالى تەنها لە (زانست) داوای لە پێغەمبەرەکەی -صلى الله عليه وسلم- کردووە داوای زیاتر بکات و شارەزاتری بکات و چاکتر و باشتر لەدین تێبگەیەنێت، چونکە هەریەکێ الله خێری بۆی بوێت ئەوا حیکمەت و دانایی زیاتر دەکات وەك دەفەرموێ: (يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ۗ وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ) البقرة- ٢٦٩. واتە: دانایی و حیکمەتی خۆیشی دەدات بە هەرکەسێک خۆی بیەوێت و فێری دەکات، بە هەرکەسیش حیکمەت و زانایی قورئان و فەرموودە بدرێت، دەرگای دونیا و قیامەتی لێ واڵا کراوە. خاوەن بیر و هۆشمەندان نەبێت، کەسانی تر لەو بەهرەیە تێ ناگەن و ئامۆژهاری وەرناگرن، چونکە هەمووکات هەر مرۆڤە ژیرەکانن بە ئامۆژگارییەکانی الله -عزوجل- بەهرەمەند بوونە.

لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا ئیمامی ابن جریر دەڵێت: قوله: ( وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ) واتە: شارەزایی لە قورئاندا بە ناسخ و منسوخەوە وە بە محكم و متشابهەوە وە بەپێشین و بە پاشین وە بەحەرام و حەڵاڵیەوە، وە هاوشێوەی ئەوان. وە هێناویەتی بەسەنەد لە:[1]

١- ( قتادة ) دەربارەی وتەی الله تعالى: "يؤتي الحكمة من يشاء"، قال: الحكمة: القرآن، والفقه في القرآن. واتە: (الحكمة ) مانای قورئانە، وە تێگەیشتن لە قورئان.

٢- لە (أبي العالية): "ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيرا كثيرا"، واتە: قورئان و تێگەیشتنیەتی.

٣- لە (مجاهد)ەوە دەربارەی وتەی الله تعالى: "يؤتي الحكمة من يشاء." واتە: مەبەست پێی پێغەمبەرایەتی، نیە بەڵكو قورئان و زانست پێی وە تێگەیشتنیەتی.

[ تفسير الطبري وە فرض طلب العلم للآجري لا ١٩ وە الفقيه والمتفقه للخطيب ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧ ]

واتە: هەریەكێك الله عز وجل فێری تێگەیشتن لە قورئان و دینی كردبێت ئەوا بەتایبەت خێری بۆ ئەو بەندەیە ویستوە.

وە لەچەندان فەرموودەی صريح و صحيح و ثابت ئەوەمان بۆ ڕوونكراوەتەوە كەوا (زانست)

---

(١)[ تفسير الطبري وە فرض طلب العلم للآجري لا ١٩ وە الفقيه والمتفقه للخطيب ١٠٥، ١٠٦، ١٠٧ ]

یەکێکە لە نیشانەکانی خێر و بێر بۆ هەریەکێ کە الله پێی ببەخشێت، إن شاء الله بە ووردی لەسەر ئەوباسە دەڕۆین و دەدوێین و شیدەکەینەوە.

**ئەو کتێبەم دابەشی سێ بەشی سەرەکی کردووە ئەوانیش:**

١- فضل العلم: پلەو پێگەی زانست.

٢- فضل العلماء: پلە و پێگەی زانایان.

٣- ڕێگاکانی فێربوونی زانستی شەرعی.

بۆ هەریەکێکیان دەیان فەرموودە و آثر و ئەقوالی سەلەفم گواستۆتەوە، هەروەها ئەو کتێبە تەنها بۆ نیشاندانی پلەو پایەی زانست نیە بەڵکو لە( باسەکانی زانست ) دا قسەمان لەسەر هەموولایەنەکانی کردووە وە مەترسی فێر نەبوون وە فێربوون و دواتر ئیهمال کردن و کار نەکردن پێی، ئەوە لە باسی زانستدا.

لە باسی(زانایان) فەزڵی زاناکان بەهەمان شێوە لەسەرەتادا لە تەفسیری سەلەف و قورئان و دواتر لە فەرموودەو آثر دا پێگەو گەورەیی و گرنگی کەسانی زانامان بەیان کردووە بۆ خوێنەر، ئینجا ئەو زانایانەی کار بە زانستەکەیان ناکەن کێن و چ هەڕەشەیەکیان لەسەرە، هەروەها لەکۆتاییدا بۆ ئاسانکاری خوێنەر، بەشێوەیەکی پووخت هەستاوم بە باسکردنی چۆنیەتی فێربوونی زانستی شەرعی لەسەر ڕێگای سەلەفی ئوممەت. هەروەها لەو کتێبەدا تەنها فەرموودەی ( صحيح ) م نەهێناوە بەڵکو گەڕاوم لە زۆرترین سەرچاوە، جگە لە صحيح ضعيف یشمان هێناوە بەتایبەت ئەو فەرموودانەی مشهور و بڵاون لەنێو خەڵکدا دواتر

(تحقیق) مان کردوون دانە دانەی هەروەها دیراسەی کۆمەڵێك فەرموودەی مشهورمان کردووە و بەیانمان کردووە لەوانیش لە باسی (زانست). ( طلب العلم فريضة ) ئەوە فەرموودەیەکی باو و مشهورە لەنێو خەڵکدا بۆیە هەستاوم دیراسەم کردووە لە کتێبەکانی (العلل) بەڵام تخریجی هەموو ڕێگاکانم نەکردووە چونکە زۆر زیاتری پێویست بوو.

ئەو کتێبە جگە لەوەی هاندەرێکە بۆ فێر بوونی زانستی شەرعی وەک سەرچاوەیەکی تحقیقیشە چونکە دەیان فەرموودەی تێدا تحقیق کراوە، ئەمەش چێژێکی تایبەت بە (طالب الإسناد) دەبەخێشت، بەیارمەتی الله عزوجل یەکەم کتێب دەبێ لەو سەردەمە لەنێو کورددا بەو شێوە نووسرابێ بەتایبەت لەڕووی (تخریج و تحقیق و تعلیق) چونکە سەنەد لێرەدا زۆر فەرامۆشکراوە وە گوێی پێنادرێ، دەبینین بەحیساب دکتۆرای هەیە یان دەیان ساڵە لەبواری فەرموودە کاردەکات کەچی گوێ نادا بەسەنەد و هەر فەرموودەیەکی بکەوێتە بەرچاو دەری دەبڕێ بێ گوێدانە سەرچاوەی زۆرێکیان، تەنانەت فەرموودەی ( منكر و موضوع ) باسدەکەن و لەخەڵکی دەکەن بەدین، بەڵام ئێمە الحمدلله ئەو بۆشاییەمان لێرەدا پڕکردۆتەوە وە تام و چێژێکی تایبەتی خودی زانستمان بۆ خوێنەر گەڕاندۆتەوە لەو کتێبە کەوا هەست بکات ڕێک لەخزمەت کتێبەکانی سەلەفە و سەنەد بەسەنەد دەچێتە خزمەتیان.

**خاڵێکی تر:** لەو کتێبە دا هەوڵم داوە زۆرترین سەرچاوە بەکار بێنم هەروەها هەر سەرچاوەیەك کەوا لەو کتێبە نوسرابێت ئەوا لەخودی ئەو سەرچاوەیەم دەرهێناوە، چونکە هیچ سەرچاوەیەک نانوسم هەتا پێش وەقت هەمووی دیراسە نەکەم و نەیخوێنمەوە.

بۆنمونە: کاتێک دەڵێم ( العلم والحلم لآدم یان العلم لزهیر بن حرب ) ئەوا لەخودی ئەو کتێبانە دەرم هێناون دوای دیراسە و خوێندنەوەیان.

**ئەو سەرچاوانەی تێیدا بەکارم هێناون بریتین لە:**

١- العلم والحلم لآدم بن أبي إياس العسقلاني: نووسەر: شێخی ئیمام بوخاری و هاوەڵانی کتوبی ستتەیە لەساڵی( ٢٢٠ یان ٢٢١ هـ ) وەفاتی کردووە، ئیمامی البخاري لە صحيح البخاري فەرموودەیەکی زۆری لێوە ڕیوایەت کردووە، وە ئەو کتێبەی ( آدم ) بەیەکێک لە کتێبە لەپێشینەیەکانی سەلەف دادەنرێ کە لە باسی(زانست) بەسەنەدی عالی نوسرابێت.

٢- العلم لزهير بن حرب، أبو خيثمة : یەکێکە لە پێشەوایانی سەلەف لەساڵی( ٢٣٤ هـ ) وەفاتی کردووە.

٣- فرض طلب العلم للآجري : یەکێکە لە پێشەوا دیارەکانی سەلەف و خاوەنی چەندان کتێبی گرنگی عەقیدەیی و علمیە، لەساڵی (٢٨٠ هـ ) لەدایك بووە وە لە ساڵی (٣٦٠هـ) وەفاتی کردووە.

٤- أخلاق العلماء للآجري، لەپێشدا باسمان کرد.

٥- جامع بيان أخذ العلم وفضله لإبن عبد البر، یەکێکە لە گرنگترین کتێبەکانی کەوا لەو بوارە نوسراوە، نوسەر یەکێکە لە زانا دیارەکانی متأخرين و نزيك سەردەمی سەلەف، لەساڵی (٣٦٨هـ ) لەدايك بووەو لە (٤٦١هـ) وەفاتی کردووە.

٦- المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي: يەكێكە لە نووسەرە دیارەكانی سەرەتایی سەردەمی متأخرین، خاوەنی زۆرترین كتێبە لەهەموو بوارەكان لە ساڵی (٣٨٤ هـ ) لەدایك بووە و لە ساڵی ( ٤٥٨هـ ) وەفاتی كردووە.

٧- الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي: يەكێكە لە دیارترین و كاریگەرترین نووسەرەكانی سەرەتایی سەردەمی متأخرین لەهەموو بوارەكان، زۆرترین كتێبی ئەوم لەو باسەدا بەكار هێناوە، لەساڵی (٣٩٢هـ ) لەدایك بووە و لەساڵی ( ٤٦٣ ) وەفاتی كردووە.

٨- الرحلة إلى طلب الحديث للخطيب البغدادي.

٩- شرف أصحاب الحديث للخطيب البغدادي.

١٠- النصيحة لأهل الحديث للخطيب البغدادي.

١١- أقتضاء العلم العمل للخطيب البغدادي.

١٢- ذم من لايعمل بعلمه لإبن عساكر الدمشقي، نووسەر خاوەنی كتێبی گەورەی (تأريخ الدمشق ) ەو لەساڵی (٤٩٩ هـ ) لەدایک بووە و لەساڵی (٥٧١هـ ) مردووە.

ئەوانە وەك كتێبی تایبەت كەوا نوسراون لەو باسەدا، واتە: باسی (زانست) هەموویم لەپێشدا خوێندووتەوەو دیراسەم كردووە ئینجا فەرمووده یان أثری تایبەتم لێدەر هێناون.

جگە لەو سەرچاوانە هەموو سەرچاوەکانی تری تایبەت بە ( كتاب العلم ) کەوا نوسراون لەنێو صحيح و سنن و مسندەکان، **لەوانەش:**

١- كتاب العلم لە صحيح البخاري.

٢- كتاب العلم لە صحيح مسلم.

٣- كتاب العلم لە سنن أبي داود.

٤- أبواب العلم لە سنن الترمذي.

٥- أبواب العلم لە مقدمەی سنن ابن ماجه.

٦- أبواب العلم لە مقدمەی سنن الدارمي.

٧- كتاب العلم لە صحيح ابن حبان، البستي.

٨- كتاب العلم لە المستدرك للحاكم.

٩- كتاب العلم لە مصنف ابن أبي شيبة.

١٠- كتاب العلم لە مسند الحارث.

١١- كتاب العلم لە شعب الإمان للبيهقي.

وە جگە لەوانەش، ئەوانە هەموویم دانە دانە دیراسە کردووە و خوێندووە ئینجا ئەگەر شتێکی تایبەت هەبوو بێ تێیدا دەرم هێناوە، واتە بۆ ئەوەی ئەو کتێبە لەڕووی تخریجەوە بەهێز بێ زۆرترین سەرچاوەم تێیدا بەکار هێناوە، ئینجا لەدوای ئەوە بۆ قۆناغی تحقیق و

دیراسەی سەنەدەکان ئەوەی کەوا خۆم دەیزانم و زانیومە ئەوا ڕاستەوخۆ بە کورتی تحقیقم کردووە، ئەوانی تر گەڕاومەتەوە سەر کتوبەکانی **وەك:**

١- العلل لإبن أبي حاتم الرازي.

٢- العلل الكبير للترمذي.

٣- العلل المتناهية لابن الجوزي.

٤- الموضوعات لابن الجوزي.

٥- الأباطيل والصحاح والمشاهير للجورقاني.

چونکە هەوڵم داوە گرنگیەکی زۆر وورد بە بابەتی سەنەد بدەم بۆنمونە دەیان فەرموودە و آثرم هێناوە کەوا لاوازن، وە ئاماژەم پێکردووە بۆ ئەوەی خوێنەر بزانێت وە تێبگات لێی، ئەو فەرموودانەی بەناوبانگ (مشهور) ن زیاتر گرنگیم بە تحقیقی داوە ئەوانی تر تەنیا نووسیومە ضعیف.

**خاڵێکی تر:** بۆ ئەوەی خوێنەر لای ڕوون بێت و نەکەوێتە دوو دڵی گوومان مەنهەجی پێشەوایان لە ( الجرح و التعديل ) دا لە کۆن و نوێ بەو شێوە بووە کەوا لە باسەکانی عەقیدە و ئیمان و بیر و باوەڕدا زۆر توندتر بوون وە ڕیوایەتی هەموو کەسێکیان وەرنەگرتووە، بەبەراورد بە باسەکانی ( زوهد و سیرەو فتن و علم ) بۆنمونە:

ئیمامی الترمذي لە سنن: لە ( أبواب الإمان ) لە چل ڕیوایەت تەنها دوو تاکو سێ دانەی ( فیە مقال ) بەڵام لە (أبواب الزهد یان علم) تاوەکو هەژدە ڕاوی زۆر ضعیف و شبە متروك یش ڕیوایەتی هێناوە، واتە لەسەلەفیش زانایان لە باسی زانستدا بە بەراورد بە عەقیدە زۆر متساهل بوون، بۆیە منیش لەو کتێبە زۆر ترین فەرموودە و آثري کەوا هەبووە هێناومە وەك شاهێدی و زانین وە هەندێکیان بۆ احتجاج پێکردن، بۆیە ووریایی ئەو خاڵە بن.

نووسینی ئەو کتێبە کەمێك بەپەلە بووە بۆیە دەکرێ هەڵەمان لەهەندێ شوێن کردبێ چونکە ئێمەش مرۆڤین و قابیلی هەڵەین.

داواکارم الله عزوجل لێمان وەرگرێت و بۆمان بکاتە توێشووی قیامەت و بێتە و ئەو زانستەی دوای مردنیش سوودمان پێ بگەیەنێت.

**کاروان کمال الکردي**

**١٤٤٤/٢/٣٠**

**دووشەممە**

## بەشی یەکەم: فضل العلم: پێگە و گرنگی زانستی شەرعي

فەرموودەی :( طلب العلم فريضة على كل مسلم ) [(١)]

### دەڵێم (الكردي):

ئەو فەرموودە لە کۆمەڵێك هاوەڵ هاتووە لەوانیش: علي بن أبي طالب وە ابن مسعود و ابن عمر وە ابن عباس و جابر بن عبدالله الأنصاري وە أنس بن مالك وأبي سعيد الخدري رضي الله عنهم.

ابن عبدالبر لە جامع بيان العلم لە باب قوله صلى الله عليه وسلم: «طلب العلم فريضة على كل مسلم» ١٥ دەڵێت: ئەو فەرموودە ڕیوایەت کراوە لە أنس بن مالك لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم لەچەندین ڕێگای جیاوازەوە هاتووە بەڵام، هەموویان ( معلول ) ن، وە هیچ یەکێکیان نابێتە بەڵگە لای ئەهلی علم بە حديث لە ڕووی سەنەدەوە.

وە ابن عبدالبر هێناویەتی لە إسحاق بن منصور الكوسج لە إسحاق بن راهوية دەڵێت: طلب العلم واجب ولم يصح فيه الخبر. واتە: هەوڵدان بۆ فێربوونی علم واجبە بەڵام لەو بارەوە هیچ خەبەرێک لەسەری صحيح نيە. [(٢)]

---

(١) (ابن ماجه لە سونەنەکەیدا هێناویەتی بە ژمارە (٢٢٤)، وە لە فرض طلب العلم للآجري هێناویەتی بە ژمارە (١٠ تاكوو ١٦)، وە ابن عبدالبر لە جامع بيان العلم هێناویەتی بە ژمارە (١٥ تاكوو ٣٠) البيهقي لە شعب الإمان هێناویەتی بە ژمارە (١٥٥٢)، وە الخطيب لە الفقيه والمتفقه هێناویەتی بە ژمارە (٥٧، ٥٨، ٥٩، ٦٠، ٦١، ٦٢)، وە الرحلة إلى طلب الحديث للخطيب بە ژمارە (١، ٢، ٣)، وە ابن جوزي لە العلل المتناهية هێناویەتی بە ژمارە ٥٠ تاكوو ٧٠)

(٢) (جامع بيان العلم ٣٣ )

ابن عبدالبر دەڵێت: مەبەستی إسحاق الله اعلم ئەوەیە کەوا فەرموودەی واجبێتی طلب العلم سەنەدیان قسەی لەسەرە لای ئەهلی علم، بەڵام ماناکەی صحیح ە لایان.

( دکتۆر نورالدین عتر ) لە تحقیقی کتابی ( الرحلة إلى طلب الحدیث ) لە لاپەڕە ٧٧ دەڵێت: ئەو فەرموودە لە پەنجا ڕێگاوە هاتووە.

ابن الجوزي لە (العلل المتناهیة ) هەموو ڕێگاکان هێناوە بۆنمونە: دەڵێت: (أما حدیث أنس فلە أربعة عشر طریقا.) واتە تەنیا فەرموودەی ( أنس ) لە ١٤ ڕێگاوە هاتووە، بەڵام دوای هێنانی هەموو ڕێگاکان دەڵێت: ( هذه الأحادیث کلها لا یثبت ) واتە هیچ یەکێک لە ڕیوایەتەکان جێگیر نەبوون بە مرفوعی لە پێغەمبەرەوە واتە هیچیان صحیح نین. لەوەی سەرەوە بۆمان دەرکەوت کەوا ئەو فەرموودە لای سەلەف و متأخرین صحیح نیە لەڕووی سەنەدەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئەلبانی و محمد بن صبحي الحلاق وە بەشێکی تر لە معاصر دەڵێن صحیحة !

بەڵام ئاوڕ بەلای ئەو حاڵەتە شازانە نادرێتەوە و هیچ قورساییان نیە لە تەرازووی علمی سەلەف. وە ڕیوایەتێکی تری مشهور هەیە بەو شێوە لە أنس بن مالك:

( أطلبوا العلم ولو بصین، فإن طلب العلم فریضة على کل مسلم) [1] بەڵام ئەوەشیان لەڕووی سەنەدەوە زۆر لاوازە بۆیە (ابن الجوزي) لە (الموضوعات) لە ( کتاب العلم ) هێناویەتی وە دەڵێت: هذا حدیث لا یصح عن رسول الله صلى الله علیه وسلم.

---

(١) ( الرحلة إلى طلب الحدیث للخطیب بە ژمارە (٣،٢،١)، وە جامع بیان العلم بە ژمارە (٢٢،٢١)، وە تأریخ البغداد للخطیب لە (ج ٩ لا ٣٦٤)، وە لە الموضوعات لابن جوزي،( کتاب العلم ) (ج ١ لا ٢١٦).

فأما الحسن بن عطية فضعفه أبو حاتم الرازي، وأما أبو عاتكة فقال البخاري: منكر الحديث.
واتە ئەو فەرموودە بە صحيحي ثابت نەبووە لە پێغەمبەرەوە بەهۆی [الحسن بن عطية ] أبوحاتم الرازي بەلاوازی داناوە، وە [ أبو عاتكة ] ئیمامی البخاري دەڵێت: منكر الحديث. كە یەكێكە لە توندترین جرحەكان لای ئەو.

وە دەڵێت: ابن حبان دەڵێت: وهذا الحديث باطل لا أصل له. واتە: ئەو فەرموودە نەك ضعيفة بگرە پووچەو ئەصلی نیە. وە لە الموضوعات لابن جوزي [1] كەواتە لەڕووی سەنەدەوە هیچ خەریكی مرفوع و صحيح نیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێشەوایان فێربوونی زانستی شەرعیان بەواجب داناوە بەم شێوە:

- ابن عبدالبر هێناویەتی لە إسحاق بن منصور الكوسج لە إسحاق بن راهوية دەڵێت: ( طلب العلم واجب ). (جامع بيان العلم ٣٣). واتە: پێشەوا ئیسحاق كوڕی ڕاهویە دەڵێت: هەوڵدان بۆ فێر بوونی زانستی شەرعی واجبە.
- پێشەوا سفيان بن عيينة دەڵێت: هەوڵدان بۆ فێر بوونی علم وجیهاد واجبە لەسەر كۆمەڵێكیان بەوەش لەسەر ئەوانی تر لادەچێت. ئینجا ئەو ئایەتەی دەخوێند: {فلولا نفر من كل فرقة منهم طائفة ليتفقهوا في الدين ولينذروا قومهم إذا رجعوا إليهم} [ التوبة: ١٢٢] .
- ابن عبدالبر دەڵێت : كۆدەنگی هەیە لای زانایان كەوا هەندێک لە علم فێربوونیان ( واجبە ) ( فرض العين ) ە، لەسەر موسڵمان وە هەندێكی فێربوونیان

(١) لە ( كتاب العلم ) (ج ١لا ٢١٦)، وە لە ( اللالىء المصنوعة للسيوطي ج ١ لا ١٧٦، لە كتاب العلم ) هێناویەتی كە تایبەتە بە فەرموودە دروستكراوەكان.

(فرض الكفاية) واتە بەکردنی چەند لەسەر ئەوانی تر لادەچێت، لەو شتانەی کەوا فێربوونی پێویستەو واجبە لەسەر تاك بەتاك ی مسڵمان بریتی یە لە: شەهادەت هێنان بە قسە و تصديق کردنی بە کردەوە وە ناسینی ئەوەی الله تاك و تەنهایە و بێ هاوبەشە، زانینی حەڵاڵ و حەرام کراوەکان و ناسینی الله بەو سیفەتاتەی خۆی وەسفی پێکردووە ... هتد

**دەڵێم:** لێرەدا جێگای ئەوە نیە کەوا هەمووی بگوازینەوە چونکە تەفاسیلێ تەواوی پێداوە، بەڵام لەوەوە بۆمان دەردەکەوێ کەوا هەندێ باس هیچ بیانوویەکی نەزانین هەڵناگرێ وەك تەوحید و ناسینی الله عزوجل بە ناو وسیفاتەکان بەو شێوەی وارد بووە لەسەلەف هتد ..

پێشەوا محمد بن الحسين الآجري دەڵێت: بزانە ڕەحمەتی الله عزوجل مان لێبێت، کەوا واجبە و پێویستە لەسەر هەر موسڵمانێکی عاقڵ و باڵغ کەوا دەوڵەمەند بێت یان هەژار یان خانەدان بێ یان نا وە ئازاد بێت یان کۆیلە وە کوڕ بێت یان کچ، یەکەم زانست لەسەری ئەوەیە الله بناسێت بە (سیفاتەکانی) وە زانستی هەبێ بەوەی چۆن الله بپەرستێ وە چۆنیەتی جێبەجێ کردنی واجبات و دوورکەوتنەوە لە حەڕام کراوەکانی .. هتد[1]

**دەڵێم:** یەکێک لەو باسانەی کەوا سەلەفی ئوممەت زۆر تأکیدیان لەسەری کردووە ئەوەیە الله بناسرێ بەسیفاتەکانی، لەپێشدا ئیجماعی ابن عبدالبريش مان نەقڵ کرد لەسەر ئەو باسە.

ناسینی الله بەناو سیفاتەکان زۆر گرنگە بەو شێوەی کەوا هاتووە، بێ لێك چواندن و بێ

---

(١)( فرض طلب العلم للأجري- لا ٥٤ )

تعطيل كردن وە بێ ئەوەی بڵێین چۆن ( كيف ) وەك لەو بارەوە قەولێكی مشهوری ئيمام مالك هەیە كەدەڵێت: الاستواء معلوم، والكيف مجهول، والإيمان به واجب، والسؤال عنه بدعة.

بڕواكردن و داننان بەوەی الله بەرز بۆتەوە و لەسەرووی ئاسمانەكانەو لەسەر عەرشە شتێكی ڕوون و زانراوە، بەڵام چۆنیەتەكەی نازانین وە پێویست ناكات موسڵمان زۆر ڕوو بچێتە نێو چۆنیەتیەوە چونكە مەزمومە، بەهەمان شێوە جێگیر كردنی ناو سیفاتەكانی تر الله وەك ئەوەی: دەستی هەیە وە دەبینێت وە دەبیستێت و پێیەكانی هەیە هتد ) بەڵام بێ لێكچواندن و شبهاندن بە دروستكراو، لێرەدا جێگای درێژە پێدانی نیە.

## دەرچوون بۆ علم وەك جیهادە:

أنس بن مالك دەفەرموێت: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هەریەک دەرچێت لە پێناو بەدەستهێنانی علم دا ئەوا وەك مجاهیدە لە پێناو الله تاوەكو دەگەڕێتەوە.[1]

**دەڵێم (الكردي):** لە ڕووی سەنەدەوە ڕیوایەتەکانی الترمذي و البيهقي والآجري و ابن عبد البر، ( أبو جعفر الرازي ) تێدایە کە ناوی : ( عيسى بن أبي عيسى بن ماهان ) فيه مقال ، صدوق إلا انه يخطئ و يغلط و يهم.

قاله ابن معين و علي ابن المديني و أبو زرعة الرازي و قال أحمد بن حنبل و العجلي و النسائي ليس بالقوي في الحديث، وذكره ابن حبان في المجروحين.

وە ئیمامی الترمذي دەڵێت: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ، وَرَوَاهُ بَعْضُهُمْ فَلَمْ يَرْفَعْهُ. بەڵام ماناکەی صحيح ە گەرچی لەڕووی سەنەدەوەش لاوازە بێگوومان دەرچوون لەپێناو (زانست) گەر مەبەستت (في سبيل الله ) بێت و ئامانج لێی خۆ شارەزاکردن بێ و ڕزگار کردنی خەڵکی بێت لە جەهل، چونکە کاتێک یەکێک دەردەچێت لەپێناو علم دا زۆر شت دەکاتە قوربانی لەوانیش ( ماڵ و سامان ) بۆیە دەبینین زۆرێك لە سەلەف لەپێناو( علم ) دا ئەوەی هەیان بووە بەخشیویانە **وەك:**

---

(١) ( الترمذي ٢٦٤٧ و المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٧١ و فرض طلب العلم للآجري ٣٠ و أخلاق العلماء للآجري ٣١ وجامع بيان العلم وفضله لابن عبد البر، في باب جامع في بيان فضل العلم ٢٧١ والحلية لأبي نعيم ٢٩٠/١٠ والطبراني في الصغير ٢٧٦/١ و العقيلي في الضعفاء ١٧/٢)

( شعبة بن الحجاج أبو بسطام ) دەڵێن: مەنجەڵێکی دایکی هەبووە فرۆشتوویەتی لەپێناو حدیثدا، وە ئیمامی ( یحیی بن معین ) هەرچی سەروەت و سامانی هەبووە کە زۆریش دەوڵەمەند بوو لەپێناو( حدیث ) دا بەخشی، وە یان ئیمامی ( مسلم بن الحجاج ) ئەوە لەڕووی ماڵ و سامان بەخشیندا، ئەی لەڕووی کردنە قوربانی خۆشیەکانی دونیاو ئەهلەکەیان دەبینین پێشەوایانی سەلەفی ئوممەت ئی وا هەبووە بیست ساڵ و ئی وا هەبووە سی ساڵ و پازدە ساڵ ئاوارەی شاروو وولاتان بووە بەسەرماو گەرما شەو و ڕۆژ لە نێو بیابان و ئاودا ڕێگایان کردووە تەنها لەپێناو (زانست)، لە کتێبی ( هەوڵی سەلەف لەپێناو علم و ترسیان لەفتوادا ) زۆر نمونەم هێناوەتەوە، کەواتە ئەگەر ئەوە وەك مجاهید نەبێ ئەی کێیە؟

## هەریەك الله خێری بۆی بویَ لەدین شارەزای دەكات:

حُمَيْدُ بْنُ عَبْدِ الرَّحْمَنِ دەڵێت: گویێم لە مُعَاوِيَة بوو، ووتاری دەدا دەیگووت: هەریەک الله چاکەی بۆ بوێت شارەزایی دەکات لەدین یان تێگەیشتووی دەکات لێی. (١)

### دەڵێم (الكردي):

شارحی فتح دەڵێت: لە پووختەی ئەو فەرموودەیە ئەوە دەردەکەوێت کەوا هەریەک لەدین تێنەگات، یانی بنەماکانی ئیسلام و ئەو شتانەی کەپەیوەستن پێیەوە لە فروعدا ئەوا لەخێردا بێبەش کراوە. وە دەڵێت: ئەوەشیان ڕوونکردەوەی ئاشکرایە لە پلەو پایەیی ( زانا )، بەسەر تێکڕایی خەڵکی بەگشتی. (٢)

لەو فەرموودەیەدا بەڵگەی ڕوون و ئاشکرا دەدات بەخوێنەر کەوا زاناکان ئەو چینەن کەوا الله تعالى خێری بۆیان ویستووە، چونکە لەدین دا شارەزایی کردوون وە کردوونی بە چرا و ڕێنیشاندەری خەڵك لە گومڕایی بۆ هیدایەت، هەڵبەت ئەو زانایانەی کەوا کاریان بەعملەکەیان کردووە لە خیر القرون وە سەلەف دا وە دوای ئەوانیش هەر زانایەکی سەر ڕاست و لەخوا ترس دەچێتە چوار چێوەی ئەو فەرموودەیە.

---

(١) ( البخاري ٧١ وە مسلم ١٠٣٧ وە ابن ماجه ٩ وە موطأ مالك ٢٦٢٣ وە الدارمي ٢٣٠ وە أحمد ١٦٨٣٤ وە العلم والحلم لآدم بن أبي إياس العسقلاني ٨٨ وە صحيح ابن حبان ٨٩ وە الطبراني لە "الكبير"١٩/"٧٢٩" و "٧٨٢""٧٨٣"، وە فرض طلب العلم للآجري ٣ وە أخلاق العلماء للآجري ١٥ وە الخطيب لە الفقيه والمتفقة ١ تاوەکو ٢٥ وە جامع بيان العلم ٨٤ )

(٢) ( فتح، شرح حديث ٧١ )

## باشترینی جاهلیەت باشترینی ئیسلامە بە هۆی علم:

أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێت: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: خەڵکی وەك كانگا وان، دەیانبینی کەوا چاکترینیان لە جاهلیەتدا چاکترینیانە لە ئیسلامدا، ئەگەر هاتوو تێبگات و شارەزابێت لەدیندا. (١)

واتە: بەهۆی تێگەیشتن لەدین دەبێتە چاکترین و باشترین ، واتە (زانست) ئەمەیان بەهەمان شێوە دەچێتە چوارچێوەی (فضل العلم)، کە خاوەنەکەی دەگەیەنێت بەلووتکە لە چوارچێوەی دینی ئیسلام، سبحان الله لە گەورەیی علومی شەرعی چ پلەو فەڵێک دەبەخشێت بەهەڵگرانی حەقیقی. داواکارم الله سبحان وتعال شارەزامان كات لەدینەکەی تێمان گەیەنێت و پێمان گەیەنێت لەڕووی علم بۆ ئەوەی بکەوینە نێو ئەو بازنەیە.

---

(١) ( البخاري ٣٣٥٣ وە أحمد ٧٤٩٦ وە مسلم ٢٥٢٦ وە والترمذي ٢٥٢٦ وە الدارمي ٢٢٩ وە الفقيه والمتفقه للخطيب ٢٦ تا ٢٩ وە جامع بيان العلم ٢٢، ٢٣ ).

## تەنها لە بەدەستهێنانی علم حەسادەت درووستە:

عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: حەسادەت بردن نیە تەنها لەدوو حاڵەتدا نەبێت، پیاوێک الله تعالى قورئانی پێ بەخشیبێت، ئەویش بەشەو وە ڕۆژ دەیخوێنێ و خەڵك فێرەکا، وە یەکێک الله ماڵی پێ بەخشیبێت لەحەق خۆیدا بە شەو و ڕۆژ بەکاری دێنێت. [١]

**دەڵێم (الكردي):** کاتێ دەفەرموێت: دوو حاڵەت حەسادەت بردن تێیدا درووستە مەبەستی ئەو حەسادەت بردنە نیە کە خەڵك دەیبات بەیەك، بەڵکو ئەوجۆرە کەوا تۆ یەکێک ئەبیینیت الله تعالى فەزڵی پێداوە و علمی پێ بەخشیوە، وە بانگەوازی پێ ئەکاو کار بەو علمە ئەکات، وەك لە فەرموودەدا هاتووە ( خيركم من تعلم القرآن و علمه )، واتە چاکترینتان ئەوانەن کەوا قورئان فێر دەبن وە خەڵکیش فێر دەکەن ، واتە (طالب العلم و العلماء) چونکە ئەوانن کەوا علم و قورئان فێر دەبن وە خەڵکیش فێر دەکەن. ئا لەو حاڵەدا تۆ بۆت هەیە بڵێی (خۆزگە منیش وەک ئەوم بزانیبا تاوەکو وەکو ئەو کارم پێکردبایە) ئەو جۆرەیان درووستە، نەك حەسادەت و نەفەس بەوەی ئەوەی هەیەتی لە علم وماڵ نەیبێ و نەیمێنێت ئەوەیان سیفەتی موسڵمان نیە، بەداخەوە ئەوەی هەیە ئەمڕۆ زۆرینەی لەوانەن کە حەسادەت دەبن ببێتە هۆی نەمانیان.

---

(١) ( البخاري ٧٣ وە مسلم ٨١٦ وە ابن ماجه ٤٢٠٨ وە أحمد ٣٥٥١ وە المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٦٣، ٣٦٤ وە صحيح ابن حبان كتاب العلم )

## فەزڵی ئەوانەی لەپێناو علم کۆدەبنەوە:

أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: هەر کۆمەڵێك لە ماڵێک لە ماڵەکانی خوادا کۆببنەوە، قورئانی تێدا بڵێن و بخوێننەوە لەنێوان خۆیاندا، ئیللا مەلائیکەت دادەبەزێتە نێویان وە ڕەحمەت و ئارامیش وە ملائیکەی بەزەیی دەوریان دەدەن وە باسیان ئەکا لەلای ئەوانەی لایەتی.[1]

**دەڵێم:** ئەوەشیان یەکێکی ترە لەو تایبەتمەندی و فەزڵانەی بەهۆی علمەوە دەدرێ بە ( طالب العلم) چونکە جگە لە فێرخواز و عالم کێ تر دەور و دیراسەی قورئان دەکاتەوە.

---

(١)(أبو داود ١٤٥٥، وە مسلم ٢٦٩٩، ٢٧٠٠، وە الترمذي ٣٣٧٨، وە ابن ماجه ٢٢٥، ٣٧٩١، وە أحمد ٧٤٢٧)

## ئەو کەسەی کە کردەوەیەکی خراپ یان چاك دادەهێنێت:

١١١١٧عَنْ جَرِيرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ (رضي الله عنه) قَالَ: جَاءَ نَاسٌ مِنَ الْأَعْرَابِ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) عَلَيْهِمُ الصُّوفُ، فَرَأَى سُوءَ حَالِهِمْ قَدْ أَصَابَتْهُمْ حَاجَةٌ، فَحَثَّ النَّاسَ عَلَى الصَّدَقَةِ، فَأَبْطَئُوا عَنْهُ حَتَّى رُئِيَ ذَلِكَ فِي وَجْهِهِ، قَالَ: ثُمَّ إِنَّ رَجُلًا مِنَ الْأَنْصَارِ جَاءَ بِصُرَّةٍ مِنْ وَرِقٍ، ثُمَّ جَاءَ آخَرُ، ثُمَّ تَتَابَعُوا حَتَّى عُرِفَ السُّرُورُ فِي وَجْهِهِ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم): (مَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً حَسَنَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كُتِبَ لَهُ مِثْلُ أَجْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْءٌ. وَمَنْ سَنَّ فِي الْإِسْلَامِ سُنَّةً سَيِّئَةً، فَعُمِلَ بِهَا بَعْدَهُ، كُتِبَ عَلَيْهِ مِثْلُ وِزْرِ مَنْ عَمِلَ بِهَا، وَلَا يَنْقُصُ مِنْ أَوْزَارِهِمْ شَيْءٌ).[١] واتە: (جریر) کوڕی (عبداللە) (خوای لێ ڕازی بێت) وتی: چەند کەسێك لە عەرەبە بیابان نشینەکان هاتنە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) کە جلی خوریيان لەبەردابوو، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بینی کە حاڵیان باش نییە و هەژارکەوتوون، هانی خەڵکیدا لەسەر خێرکردن، خەڵکەکە سستیان کردوو، زوو کارەکەیان ئەنجام نەدا هەتا لە ڕوخساری پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) بێزاری دەبینرا، پاشان پیاوێکی ئەنصاری تورەکەیەکی هێنا کە زیوی تیابوو، پاشان پیاوێکی تر هات پاشان بەدوای یەکدا هاتن هەتا خۆشحاڵی لەناوچاوانیدا دەبینرا و فەرمووی: (هەر کەسێك لە ئیسلامدا شتێکی باش دابهێنێت و لە دوای خۆی پەیڕەوی بکرێت، ئەوا پاداشتی ئەوانەی دەست دەکەوێت کە پەیڕەوی دەکەن، بێئەوەی پاداشتی ئەوان کەم ببێتەوە،

---

(١) ( آدم بن أبي إياس له العلم والحلم ٩٨ و ٩٩، وه مسلم ١٧٧، وه النسائي ٢٥٥٤، وه أحمد له المسند، وه ابن حبان له صحيح والطبراني له الكبير.)

هەرکەسێکیش کارێکی خراپ داپهێنێت و، پاش خۆی پەیڕەوی بکرێت ئەوا تاوانی هەموو ئەوانەی لەسەرە کە پەیڕەوی دەکەن بێئەوەی لە گوناهەکانی کەم بێتەوە.

**دەڵێم (الكردي):** ئەو فەرموودە دەچێتە چوار چێوەی ( زانست) یش، واتە ئەوانەی لەڕێگای زانستی شەرعیەوە خەڵك فێرەکەن، چونکە فێرکردن و پێگەیاندنی خەڵك دەچێتە چوارچێوەی سوننەی حەسەنە، بۆنمونە : نوسینی کتێبێک لە بابێک لە بابەکانی زانستدا وەك نوسینی ( صحيح البخاري یان مسلم یان مسند أحمد یان ئەبوابی فقهی ) ئەوانە ئوممەتێک سوودی لێدەبینن و لەسەری دەڕۆن، یەکێکە لە گەورەترین و چاکترین داهێنان لەئیسلامدا، چونکە دەبێتە هۆی زیندوو هێشتنەوە علومی شەرعی و دین، گەر کتێبەکانی ئەوان نەبووایەن ئێمەی نەزان چۆن و بەچ شێوەیەك دەمانتوانی تەنانەت یەک فەرموودەی صحيح بدۆزینەوە، کەچی ئەمڕۆ کەسانێکی ( نەزان و گومڕا ) دەرچوون و نەك ڕێز لەو سوننە حەسەنەیە ناگرن بگرە دەڵێن ئەو کتێبانە (بتن!)، ناکرێ و نابێ ئێمە دین لەو کتێبانە وەر گرین ، و لاحوله ولاقوة إلا بالله لەو سەردەمەی تێیداین و تێ کەوتووین خەراپترین هەڵاتنی خۆر هەڵاتێ ئەو سەردەمەیە کە فتنە وەک شەوی تاریک داباریوە بەسەر ئوممەت.

## ئەوەی خەڵکی بانگ دەکات بۆ ڕێگای هیدایەت یان گومڕایی:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ (رضي الله عنه): أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) قَالَ: (مَنْ دَعَا إِلَى هُدًى كَانَ لَهُ مِنَ الْأَجْرِ مِثْلُ أُجُورِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ أُجُورِهِمْ شَيْئًا. وَمَنْ دَعَا إِلَى ضَلَالَةٍ، كَانَ عَلَيْهِ مِنَ الْإِثْمِ مِثْلُ آثَامِ مَنْ تَبِعَهُ، لَا يَنْقُصُ ذَلِكَ مِنْ آثَامِهِمْ شَيْئًا). واتە: (أبو هريره) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی: (هەر کەسێك بانگی خەڵکی بکات بۆ ڕێگای هدایەت، ئەوە بە ئەندازەی پاداشتی ئەوانەی کە شوێنی دەکەون پاداشتی دەستدەکەوێت، هیچ لەپاداشتی ئەوان کەم ناکات، هەر کەسێکیش بانگی خەڵکی بکات بۆ گومڕایی، ئەوا تاوانی لەسەرە وەك ئەوانەی کە شوێنی دەکەون و هیچ لە تاوانی ئەوان کەم ناکات).[1]

(١) ( مسلم ٢٦٩٩، الترمذي ١٤٢٥، وابوداود ٣٦٤٣، وابن ماجه ٢٢٥، والدارمي ٣٥٦، واحمد ٧٤٢٧ )

## ڕێگای علم ڕێگای بەهەشتە:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " مَا مِنْ رَجُلٍ يَسْلُكُ طَرِيقًا يَطْلُبُ فِيهِ عِلْمًا إِلَّا سَهَّلَ اللَّهُ لَهُ بِهِ طَرِيقَ الْجَنَّةِ . واتە: هیچ پیاوێک نیە ڕێگایەك بگرێتە بەر بەمەستی فێربوونی (علم ) واتە: دین ئیللا الله عزوجل ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکەن.[1]

**دەڵێم (الکردي):** ئەو فەرموودە مشهورە دەلالەتێکی زۆر ڕوونە بۆ موسڵمان کەوا تێبگات لەوەی گرتنەبەری ڕێگای زانست و زانیاری دەبێتە هۆکاری ئاسانکاری بۆ چوونە بەهەشت، واتە: چوونە بەهەشت پەیوەستە بەزانستەوە چونکە گەر یەکێک زانستی نەبێت بەوەی الله عز وجل بناسێت بەسیفات و زانستی نەبێ بە ئەحکامەکانی دین و حەڵاڵ و حەڕام لێك نەکاتەوە وە کوفر و شرك لێک ناکاتەوە ئەوا (نەزانینەکەی) بەرەو دۆزەخی دەبات پەنا بە الله چونکە گەر (زانست) هۆکاری چوونە بەهەشت بێت ئەوا بەپێچەوانەوە (نەزانین) هۆکاری خستنە نێو دۆزەخە.

(١)( مسلم ٢٦٩٩، وە الترمذي ٢٩٤٥ وە أبو داود ٣٦٤٣ وە ابن ماجە ٢٢٥ وە الدارمي ٣٥٦ وە أحمد ٧٤٢٧ )

## علم دوای مردنیش سوودت پێدەگەیەنێت:

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ، أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : " إِذَا مَاتَ الْإِنْسَانُ انْقَطَعَ عَنْهُ عَمَلُهُ إِلَّا مِنْ ثَلَاثَةٍ ؛ إِلَّا مِنْ صَدَقَةٍ جَارِيَةٍ، أَوْ عِلْمٍ يُنْتَفَعُ بِهِ، أَوْ وَلَدٍ صَالِحٍ يَدْعُو لَهُ ". واتە: هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرمووێت : رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی : کاتێک مرۆڤ دەمرێت هەرچی کردەوەیە کۆتایی دێ واتە دەپچڕێت ، تەنها سێ شت نەبێت، خێرو چاکەیەکی کردبێت، یان زانستێک سوودی پێ بگەیەنێت، یان منداڵێکی چاك کە دوعای بۆ بکات.[1]

**دەڵێم (کاروان کەمال الكردي):** ئەو فەرموودە یەکێکە لە گرنگترین ئەو فەرموودانەی کەوا گەورەیی و فەزڵی (زانست) بەتایبەت بۆ موسڵمان دەردەخەن، وە هاندێکە بەتایبەت بۆ موسڵمان کەوا خۆیان فێری علم بکەن ئینجا خەڵکیش فێربکەن.

(١) (مسلم ١٦٣١ وە أبو داود ٢٨٨٠ وە الترمذي ١٣٧٦ وە النسائي ٣٦٥١ وە الدارمي ٥٧٨ وە أحمد ٨٨٤٤ وە ابن ماجه ٢٤٢ وە المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٦١)

## گەورەیی مجلیسی ( علم ):

١- عبد الله بن عمرو بن العاص رضي الله عنهما دەفەرموێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ڕۆیشتە نێو مزگەوت، دوو دانیشتنی بینی ( مجلیس ) مەجلیسێکیان یادی الله یان دەکرد و دووعایان ئەکرد، یەکی تریان خۆیان فێری تێگەیشتن لەدین ئەکرد، رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی : هەردوو لایان لەسەر خێر و چاکەن ، یەکێکیان یادی الله یان دەکرد و دووعایان ئەکەن گەر الله ویستی وابێت پێیان ئەدا یان پێیان نادا، ئەویتریان خۆیان فێرەکەن وە کەسانی جاهلیش ، وە من نێردراوم وەك فێرکەر واتە ( مامۆستا ) ئەوانە چاکترن، ئینجا لایان دانیشت.

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە هەموو ڕیوایەتەکان دەچێتەوە سەر (عبد الرحمن بن زياد بن أنعم الإفريقي ) کەوا پێشەوایانی ( الجرح والتعديل ) قسەیان لەسەر کردووە بەو شێوەیە:

**ئەو زانایانەی ( جرح ) یانکردووە:**

أحمد بن حنبل دەڵێت: ليس بشيء، وە دەڵێ : فەرموودەی لێوە نانوسمەوە، وە دەڵێ : منكر الحديث.

---

(١)( مسند الحارث كتاب العلم (باب فضل العلماء ٤٠) وە جامع بيان العلم ١٩٧ وە الزهد لابن المبارك ١٣٨٨ وە الطيالسي ٢٢٥١ وە الدارمي في السنن وە الفقيه والمتفقه للخطيب ٣٠،٣١،٣٢،٣٣،٣٤)

أبو حاتم الرازي: يكتب حديثه ولا يحتج به، واته فەرموودەی دەنووسرێتەوە بەڵام ناكرێتە بەڵگە.

أبو زرعة الرازي : ضعيف أفضل من ابن لهيعة ومرة: ليس بقوي، بە لاوازی داناوە بەڵام دەڵێت باشترە لە ( ابن لهيعة )

علي بن المديني : أصحابنا يضعفونه، وأنكروا عليه أحاديث تفرد بها لا تعرف، وە علي دەڵێ هاوەڵان بە لاوازيان داناوە.

أبو عيسى الترمذي: ضعيف عند أهل الحديث. واتە لاوازە لای زانایانی حديث دا.

أحمد بن شعيب النسائي: ضعيف

الدارقطني: ضعيف لايحتج به

محمد بن إسحاق بن خزيمة: متروك، لا يحتج به.

**ئەو زانایانەی جرحیان نەکردووە بەڵام بە ثقة شیان دانەناوە:**

يحيى بن سعيد القطان دەڵێت : يحتج بحديث الإفريقي فهو صحيح الكتاب، ومرة: ليس به بأس وفيه ضعف وهو أحب إلي من ابن أبي مريم الغساني . واتە پشتی بە ڕیوایەتی عبدالرحمن دەبەسترێت، وە صحيح الكتاب ، ئەگەر لە کتاب بێت وە کێشەی نیە وە هەندێ لاوازی تێدایە وە ئەو لای من چاکترە لە ابن أبي مريم الغساني.

وە أبو دواد السجستاني دەڵێ : يحتج بحديثه صحيح الكتاب .

وه أحمد بن صالح المصري : يحتج بحديث الإفريقي فهو صحيح الكتاب، وهو من الثقات ومن تكلم فيه فليس بمقبول.[١]

**دەڵێم:** لێرەدا احمد بن صالح تعديلى كردووە وە بە ثقة شى داناوە بەڵام ئەو قەولەی مردودە کەدەڵێ: ئەوەی قسەی لەسەر کردبێت مقبوڵ نیە، چونکە لەسەرەوە چەندان گەورە پێشەوای سەلەفمان داناوە کەوا لەو لەپێشترن. وە محمد بن إسماعيل البخاري دەڵێت: مقارب الحديث.

وە يحيي بن معين لەچەند شوێنێک قسەی لەسەر کردووە:

لە ڕیوایەتی العباس الدوري دەڵێت: ليس به بأس وفيه ضعف وهو أحب إلي من أبي بكر بن أبي مريم. وە لە رواية الدارمي دەڵێت: ضعيف ويكتب حديثه وإنما أنكر عليه الأحاديث الغرائب التي كان يجيء بها، وە لە رواية ابن محرز دەڵێت: ليس بذاك القوي.

**دەڵێم:** ڕاسترین ڕیوایەت یاخود پێکاوترینیان لە ابن معين، عباس الدوريە کە دەڵێت؛ ليس به بأس وفيه ضعف وهو أحب إلي من أبي بكر بن أبي مريم, واتە جرح ە بەڵام لەپلەیەکی نزمدا نەك جرحێکی توند چوونکە بەراوردی ڕاوی تری ضعيف ی کردووە.

---

(١) ( ميزان الإعتدال للذهبي ٤٨٦٦)

**قال الكردي:** زۆرینەی ئەهلی علم بەلاوازیان داناوە بەڵام وەک بینیمان بەتووندی جرحیان نەکردووە بۆیە فەرموودەکانی دەنوسرێنەوە و پیشان دەدرێن،وەك لەپێشدا باسمان کرد زانایان متساهل بوون لە ڕیوایەت کردنی فضائل، بەڵام ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت کەوا بکرێنە بەڵگە والله أعلم. لەگەڵ ئەوەشدا زانایان لە سەلەف و خەلەف وەک هاندانێک بۆ خەڵك استدلالیان بەو فەرموودە کردووە و لەو کتێبانە هێناویانە کە تایبەت بووە بەعلم.

٢- عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ قَالَ : قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ : " لَأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللَّهَ تَعَالَى مِنْ صَلَاةِ الْغَدَاةِ حَتَّى تَطْلُعَ الشَّمْسُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أَرْبَعَةً مِنْ وَلَدِ إِسْمَاعِيلَ، وَلَأَنْ أَقْعُدَ مَعَ قَوْمٍ يَذْكُرُونَ اللَّهَ مِنْ صَلَاةِ الْعَصْرِ إِلَى أَنْ تَغْرُبَ الشَّمْسُ أَحَبُّ إِلَيَّ مِنْ أَنْ أُعْتِقَ أَرْبَعَةً ". ئیمامی أبو داود هێناویەتی لە هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك رضي الله عنه دەڵێ : رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: گەر بێت و لەگەڵ کەسانێکدا دابنیشم کەوا زیکرو یادی الله عزوجل دەکەن تاوەکو خۆر هەڵاتن لام خۆشترە یان (چاکترە) لە ئازاد کردنی چوار کۆیلەی( کوڕانی ئیسماعیل ) وە گەر دابنیشم لەگەڵ کۆمەڵانێکدا کەوا زیکر و یادی الله دەکەن لە نوێژی عەسرەوە تاوەکو خورئاوابوون لام خۆشترە لە ئازاد کردنی چوار لەکوڕانی ئیسماعیل.[1]

---

(١) ( سنن أبو داود، كتاب العلم ، ٣٦٦٧ واللفظ له )

**دەڵێم:** لەڕووی سەنەدەوە رجالەکان هەمووی( ثقة )ن ئیللا (مُوسَى بْنُ خَلَفٍ الْعَمِّيّ ) نەبێت کەوا ( فيه مقال ) يحيى بن معين لەڕیوایەتی إسحاق بن منصور و أحمد بن أبي يحيى دەڵێت: ليس به بأس. وە لە ڕیوایەتی ابن الجنيد دەڵێت: ضعيف. وە أبو حاتم الرازي دەڵێت: صالح الحديث. وە عفان بن مسلم و يعقوب بن أبي شيبة و العجلي دەڵێن: ثقة. وە الدارقطني لە سؤلاتی البرقاني دەڵێت: يعتبر به. وە ابن حبان لە المجروحين بەتوندی جرحی دەکات. الذهبي لە (الكاشف ٣/٣٠٣ ): نەقڵی تعديلی دەکات وە ابن حجر لە التقريب دەڵێ: صدوق بەڵام، لە أوهام.

٣- وە خطيب البغدادي هێناویەتی لە ڕێگای يزيد الرقاشي عن أنس بن مالك دەڵێ: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی گەر لەگەڵ کۆمەڵێك دابنیشم کەوا یادی الله تعالى دەکەن لە بەیانی تاوەکو خۆرهەڵاتن پێم خۆشترە لە هەڵاتنی خۆر وە لە عەسر تا ئاوابوونی خۆر لەووە لەوە. (١)

**دەڵێم:** لەڕووی سەنەدەوە [ يزيد الرقاشي ) تێدایە کەوا ( ضعيفة)، بۆیە ڕیوایەتی( أبو داود ) صحيح ترە لەوە بەڵام، لەبابی ( الترغيب ) وەری دەگرین بۆیە ( المنذري ) لە الترغيب والترهيب بە ( حسن ) ی داناوە.

(١)( الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي ٣٥ )

**شیکردنەوەی مەتن:** واتە دانیشتن بۆ( علم ) چونکە هەریەك لە أبو داود و الخطیب لە أبوابی علم هێناویانە ، ئەمەش دەلالەتە لەگەورەیی و گرنگی فێربوونی( علومی شەرعی ).

## تێگەیشتن لەدین باشترە لە بەندایەتی کردن بە جهل:

خطیب البغدادي هێناویەتی لە ( ضرار بن عمرو ) دەفەرموێ : کەسانێک وازیان لە ( علم ) هێناو و وازیان لە کۆڕ و مەجلیسی ئەهلی علمیش هێنا ، جێگایەکی تایبەتیان درووست کرد تەنها بۆ نوێژ و ڕۆژ و تاوای لێهات هەندێکیان پێستیان بە ئێسکیانەوە نووسا ، ئینجا پێچەوانەی سوننەتیان کرد ، وە تیاچوون ، نەخێر سوێند بەوەی هیچ خوایەکی تر نیە جگە لەو ، هیچ کەسێک نیە کارێک بکات بەجهل ، ئیللا خەراپەی زیاترە لە باشیەکەی. ( الفقیه والمتفقه للخطیب البغدادي لا ١٠٦ ژ ٦٥ ). وە هێناویەتی لە( نافع ) دەڵێ : یەکێ پرسیاری کرد لە ( ابن عمر) رضي الله عنهما پێی گووت : ئەی باوکی عبدالرحمن شتێکم پێ بڵێ بەرەو خێرم ببات ، ئەویش فەرمووی : (تێگەیشتن لەدین )، گووتی : لەوانەیە لێم تێنەگەیشتبێ ، با دووبارە پێی بڵێمەوە ، گووتی من دەڵێم داوات لێدەکەم شتێکم فێرکەیت بەرەو خێرم ببات ؟ ابن عمر پێی فەرموو: هاوار بۆت جارێکی تر، ئایا تێگەیشتن لەدین باشتر نیە لە کردەوەیەکی زۆر؟ کەسانێک خۆیان لەماڵدا جێگیر کرد و بەڕۆژوو بون و نوێژیان کرد تاوای لێهات پێستەکانیان ووشک بوو بە ئێسکانیەوە، بەڵام، هیچ هەنگاوێک پێی لە الله نزیک نەبوونەوە تەنها دووری نەبێت.[1]

---

(١) ( الفقیه والمتفقه للخطیب البغدادي لا ١٠٧ ژ ٦٤ )

وە هێناویەتی لە عمری کوڕی عبدالعزیز بە هاوشێوەی ئەو دوو ڕیوایەتە.

**دەڵێم:** گەرچی لەڕووی سەنەدەوە ( لاوازن ) بەڵام، ماناكانیان تەواوە چونكە عیبادەت و بەندایەتی كردنی خالق بە ( جهل ) زیانی زیاترە وەك لە سوودی وە بەندایەتی كردن دانامەزرێت بە جهل تەنیا بە( علم ) نەبێ وە قبوڵ نابێ ئیللا بەو شێوە نەبێ كە بۆمان هاتووە، ئەمەشیان دەلالەتە لە گرنگی و گەورەیی ( علم) بەسەر كردەوەدا، چونكە هەوڵدان بۆ فێربوونی علم جگە لە وەی ڕزگاركەری بەندەیە لە( جهل ) بەشێكە لە عیبادەت.

## ڕێزگرتنی سەلەف لە ئەهلی علم:

أبي العالیة دەڵێت: من دەهاتمە لای ابن عباس رضي الله عنهما دایدەنیشاندم لای خۆی لەسەر سەریر، وە قورەیش لەخوار بوون، وەک بڵێی لایان ناخۆش بوو، دەیان گووت: ئەو بەندەیە یان كۆیلەیە بەرزەكاتەوە سەر سەریر، ابن عباس رضي الله عنهما پێیانی فەرموو: ئا ئەو زانستە پلەی خاوەن ڕێز زیاد دەكات، كەسانی بەندە ( كۆیلە ) دادەنیشێنێت لەسەر تەختی بەرز یان سەریر.[1]

---

(١) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ژ ٣٩٨ وە الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي لا ١٣٩ ژ ١١٧ )

**دەڵێم:** ئەوەسیفەتی زۆرینەی سەلەفی ئوممەت بووە هەر لە هاوەڵان و تا دوا چینی أتباع التابعین، بەوەی کەوا ڕێزی زۆریان لە هەڵگرانی علم گرتوە ، چۆن ابن عباس ڕێزی لەو بەندەیە گرتوە کەوا خاوەن علم بووە ، بەهەمان شێوە لەپێش ئەو دا ئیمامی عمر رضي الله عنه ، ڕێزی زۆری لە پێشەوا عبدالله بن عباس دەگرت بەهۆی زانستەکەی ، دایدەنیشاند لە کۆڕو کۆبوونەوەی گەورە پیاوانی ئوممەت ، وە داوای لێدەکرد کەوا تەفسیری قورئانیان بۆ بکات، ئەوەشیان یەکێکی تر بوو لە ( فضل العلم ).

## بیانووی نەزانین بۆ هیچ کەس نیە:

آدم بن أبي إياس هێناویەتی لە أبي الأحوص حكيم بن عمير العنسي دەڵێت : عمر بن الخطاب رضي الله عنه نامەی نارد بۆ ئەمیرەکان ، بۆی نوسین : خۆتان فێری دین بکەن چونکە هیچ بیانووەك نیە بۆ کەسێک کەوا شوێن باطل بکەوێ وابزانێت حەقە وە واز لەحەقێك بێنێت پێی وابێت کەوا باطلة.[1]

**دەڵێم:** لەڕووی سەنەدەوە : ئەو آثرە لاوازە ، وە لەڕێگەی ترەوە هاتووە ، پێشەوا( البربهاري ) لە شرح السنة , هێناویەتی لە ئیمامی الأوزاعي دەڵێت : پێمان گەیشتووە لە عمر بن الخطاب رضي الله عنه کەوا فەرموویەتی: هیچ بیانووەك نیە بۆ یەکێک کەوا شوێن باطل بکەوێت پێی

وابێت لەسەر هیدایەتە وە بە پێچەوانەوە، بەڵام ئەویشیان بەهەمان شێوە سەنەدی لاوازە

(١) ( العلم والحلم لآدم بن أبي إياس العسقلاني ٨٨ )

چونکە متصل نیە الأوزاعي دەڵێ پێمان گەیشتوە ، ئیمامی عمر زیاتر لە ٦٠ ساڵ پێش لەدایک بوونی ئیمامی الأوزاعي وەفاتی کردووە ، دوای بەدوا داچوون بۆم دەرکەوت کەوا ئەو قەولە دەگەڕێتەوە بۆ پێشەوا ( عمر بن عبدالعزیز ).

بەڵام ماناکەی تەواوە چونکە هەم لەقورئان وە هەمیش لە سوننەت چەندان دەق ئەوە دەسەلمێنن کەوا عوزر نیە بۆ ئەوانەی لەنێو گومڕاییدا بن و پێیان وابێ لەسەر ڕێگا ڕاستن ، بۆیەش لەسەر خوێنەری موسڵمان پێویستە کەوا خۆی فێری ئموری دینەکەی بکات.

## سەلەف منداڵەکانیان هاندەدا بۆ علم:

الزبیر بن بکار دەڵێت : باوکم نامەیەکی بۆم نووسی و گووتی : ئەی کوڕەکەم ، دەست بگرە بە زانست ( علم ) چونکە سوێند بە الله زۆر باشترە بۆت لە میراتی باوکت ، دەڵێ : چووم بۆ مامم مصعب بن الزبیر م باس کرد ، پێی گووتم : سوێند بە خوا ڕاستی کرد وەو باشترین ئامۆژگاری کردوویت ، کوڕەکەم ، دەست بگرە بە علم ( زانست ) چونکە گەر پێویستت پێی بێت ئەوا بۆت وەك ماڵ وایە واتە ( پارە ) وە ئەگەر لێشت زیاد بێت ئەوا بۆت جوانیە.[(١)]

ئەوەش ئامۆژگاری پێشەوایانی سەلەف بۆ منداڵەکانیان

---

(١)( المدخل إلى سنن الکبرى للبیهقي ژ ٣٩٩، )

نەیانگووت کوڕم هەوڵدە پارە پەیاکە یان خانوو بکڕە، بەڵکوتاکە ئامۆژگاریان بۆیان دەست گرتنە بە علم چونکە مرۆڤ بەهۆی علم ڕزگاری دەبێت لەجهل وەبەردەوام موسڵمان پێویستی بە علمە بۆئەوەی ڕێگا وون نەکات ، سبحان الله کاتێ دەڵێت ئەگەر لێت زیاد بوو یان زیادی کرد ئەوا جوانیە بۆت ، مەبەست بەرز بوونەوەی پلەی هەڵگرانی علمە وە ڕێز و تەقدیری زیاتر.

هشام بن عروة دەڵێت: باوکم ئێمەی کۆدەکردەوە وپێی دەگووتین: ( ڕۆڵەکانم، کوڕەکانم ) ئێمە سەردەمانێک بچووکی نێو خەڵکی بووین، وە ئێمە ئەمڕۆ گەورەیانین، وە ئێوەش ئەمڕۆ بچوکن وە دەبن بەگەورەی قەومەکەتان ئەگەر بمێنن، وە خێر لە زۆری نیە بێ زانست ( علم ) بێت، دەڵێت : ئینجا فەرموودەی لە لە عبدالله بن عمر رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە صلی الله علیه وسلم  بۆ باس دەکردین لەبارەی نەمانی زانست ( علم ).[1]

**قال الكردي:** ئەوەی کە ئامۆژگاری دەکرێت ( هشام بن عروة) وە ئامۆژگاری کار ( عروة بن الزبیر )، بەدڵنیاییەوە بەهۆی علم عروة بوو بە یەکێک لە هەرە گەورەترین پێشەوایانی ئیسلام لە چینی  ( التابعین ) وە بە یەکێک لە (علماء السبعة ) دانراوە هەمووی بەهۆی (فضل العلم ) کوڕەکەی( هشام ) بەهەمان شێوەی باوکی بوو بەیەکێک لە هەڵگرانی علم وە

---

(١)( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ژ ٤١٥ )

یەكێ لە دیار ترین پێشەواایانی سەلەف و ئوممەتی ئیسلام ئەویش بەهۆی ( فضل العلم ) سەلەف ڕەحمەتی الله یان لێبێت دەیانزانی تاكە ڕێگای سەربەرزی و ڕێز و عیزەت تەنها دەستگرتن بوو بە علم بۆیە ئامۆژگاری خۆیان و منداڵەكانیشیان دەكرد تەنها بە دەستگرتن بە [ علم ]، واتە فێربوونی زانستی شەرعی.

## فەزڵی علم لای هاوەڵان:

أبو هريرة رضي الله عنه : خطيب البغدادي هێناویەتی لە أبو هريرة رضي الله عنه دەفەرموێت : گەر بێت تەنها ( بابێك ) لە (علم ) دەربارەی ( ئەمر و نەهی كردن )فێربم لام خۆشترە لەوەی حەفتا غەزوە بكەم لە پێناو الله دا.

علي بن أبي طالب رضي الله عنه : پێشەوای ئیمانداران علي بن أبي طالب رضي الله عنه لەبارەی ئایەتی : {قوا أنفسكم وأهليكم نارا} [ التحريم: ٦] واتە: خۆتان و خێزانەكانتان فێری چاكە بكەن واتە ( علم).

(١) ( الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي لا ١٠٢ ژ٥٢ ).

(٢)( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٧٢ )

عبدالله بن مسعود رضي الله عنه:

١- پێشەوا الأوزاعي دەڵێت:

پیاوێک هات بۆ لای ابن مسعود و پێی گووت : ئەی باوکی عبدالرحمن ، چاکترین کار کامەیە ؟ گووتی: ( العلم، زانست ) ئەویش پێی گووت : بەڵام من پرسیاری چاکترین کارت لێدەکەم و تۆش دەڵێیت : علم ، پێی گووت : هاوار بۆت ، لەگەڵ هەبوونی علمت بە الله عز وجل دا کاری زۆر و کەمیش سوودت پێدەگەیەنێت ، بەڵام جاهل بیت بە الله سبحان وتعال ئەوا سوودت پێناگەیەنێت ، کاری زۆریان کەم.[١]

**دەڵێم:** لەڕووی سەنەدەوە (ضعيفة ) چونکە ( منقطعة ) ئەویش بەهۆی ئەوەی الأوزاعي لە أتباع التابعين وە لە ساڵی (٨٧ ك ) لەدایك بووە، بەڵام ابن مسعود لە ساڵی (لەنێوان ٣٠ تا ٣٤ ك) وەفاتی کردووە بۆیە مقبول نیە.

٢- زيد بن أسلم دەڵێت:

عبدالله بن مسعود دەیگووت : گەر لە مەجلیسێکی فقهدا بۆ یەک سەعات دابنیشم پێم خۆشترە لە ڕۆژووی ڕۆژەکە و شەو نوێژەکەی.[٢]

---

(١) (المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٤٦٦ وە العلم والحلم لآدم ٣٠٧)

(٢) ( المدخل إلى سنن الكبرى ٤٦١ )

٣- عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت:

بەیانی بکەرەوە کەوا زانا بیت یان فێرخوازیان گوێگر، وەمەبن بەچوارەم تیادەچن.[١]

٤- عبدالله بن مسعود دەڵێت:

ئەی خەڵکینە، فێربن یا خۆتان فێرکەن، وە ئەوەی فێربوو با کاری پێ بکات.[٢]

عبدالله بن عباس رضي الله عنهما:

١- مطرف دەڵێت: گوێم لە ابن عباس بوو دەیگووت: خوێندنەوەی یەک سەعاتی علم چاکترە لە زیندوو کردنەوەی شەوەکە، وە شەو نوێژ.[٣] ( المدخل إلى سنن الكبرى ٤٥٦ )

**دەڵێم:** أبو بكر البيهقي دەڵێت: ئەو فەرموودە لە ابن عباس ڕیوایەت کراوە بە مرفوع بەلام بەسەنەدی لاواز، کە ڕاستی ئەو قەولە دەگەڕێتەوە بۆ مطرف بن عبد الله بن الشخير.[٤]

---

(١) (العلم والحلم لآدم بن أبي إياس ١٣٣وه العلم لزهيربن حرب ١١٦ )

(٢) ( العلم لزهير ٣)

(٣) ( المدخل إلى سنن الكبرى ٤٥٦ )

(٤) (المدخل إلى سنن الكبرى ٤٥٦ )

٢- عنترة دەڵێت: گوێم لە ابن عباس بوو رضي الله عنهما دەیفەرموو: هیچ پیاوێک نیە رێگایەک بگرێتە بەر بەمەبەستی فێربوونی علم ئیللا الله عزوجل رێگای بەهەشتی لەسەر ئاسان دەکات.[١]

## فەزڵی علم لای التابعين:

علقمة بن وقاص: علقمة بە هاوەڵانی دەفەرموو: بابرۆین تاوەكو ئیمانمان زیاد كەین، یعنی بە تێگەیشتن لەدین. مەبەستی فێربوونی علمە.[٢]

سعيد بن المسيب : ئیمامی الآجري هێناویەتی لە پێشەوا سعيد بن المسيب دەفەرموێت: باشترین (چاكترین ) عیبادەتی الله بریتی یە لە تێگەیشتن لە دین وە بیركردنەوە لە درووستكراوەكانی الله.[٣]

الحسن البصري:

١- پێشەوا ( الحسن البصري ) دەفەرموێت: گەر تەنها یەک ( باب ) لە ( علم ) فێربم و موسڵمانێكی پێ فێربكەم، زۆر لام خۆشترە لەوەی دونیا هەمووی ئی من بێت و لەپێناو الله بیبەخشم.[٤]

---

(١) (العلم لزهير بن حرب ١٧ )
(٢) (الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي ١٤٣ )

(٣) (فرض طلب العلم للآجري ٤ وە ابن سعد لە طبقات ١٣٥/٥ )

(٤) (الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي لا ١٠٢ ژ٥٣ )

٢- پێشەوا الحسن البصري دەیگووت: لە خێر و چاکە ئەوەیە کەوا گوێ لە فقە ڕابگریت و دواتر باسیکەیتەوە، یان بیلێیتەوە یان بڵاوی کەیتەوە.[(١)]

٣- وە لە ڕیوایەتی البیهقي هاتووەلە خێروچاکە ئەوەیە فێری علم بیت و خەڵکیش فێربکەیت.[(٢)]

مطرف بن عبد الله: مطرف بن عبد الله دەڵێت : علم ( زانست ) باشتر ( چاکترە ) لە ( عمل ) کردەوە، ئایا نابینن (راهیب) لەشەو دا هەڵدەستێ بۆ عیبادەت تاوەکو بەیانی دێ و( شرك ) دەکات.[(٣)]

زید بن أسلم: (زید بن أسلم) لەبارەیی ئایەتی: (ولقد فضلنا بعض النبیین علی بعض) [الإسراء: ٥٥] واتە: علم بەزانست.[(٣)]

یحیی بن أبي کثیر: عبد الله بن یحیی بن أبي کثیر دەڵێت: گوێم لەباوکم بوو دەیگووت: میراتی زانست (علم) زۆر چاکترە لە زێڕ، وە نەفسی چاکیش باشترە لە لۆلۆ.[(٥)]

---

(١) ( الفقیه والمتفقه للخطیب ١٤٤ )   (٢) (المدخل إلی سنن الکبری للبیهقي ٣٩٧وە العلم لزهیر بن حرب )

(٣) (الفقیه والمتفقه للخطیب البغدادي لا ١١٠ ژ٦٧ )

(٤) (المدخل إلی سنن الکبری للبیهقي ٣٤٤ )

(٥) ( حلیة الأولیاء ٣/٦٦ و المدخل إلی سنن الکبری ٤٠٠ والفقیه والمتفقه للخطیب ٢/١٠٣ )

یحیى بن أبي كثير دەڵێت:

فێربوونی فقه‍ ( نوێژە ) وە دیراسەکردنی قورئانیش ( نوێژە).[1]

الأصمعي: أبو داود سليمان بن معبد دەڵێت: گوێم لە الأصمعي بوو دەیگووت:

هەریەک سەعاتێک بەرگەی(نارەحەتی یان زەلیلی)فێر بوون نەگرێت، تامردن لە زەلیلی جەهالەت دەمێنێتەوە.[2]

موسى بن يسار:

خطيب هێناویەتی لە محمد بن عمرو بن عطاء گووتی: موسى بن يسار لەگەڵ ئێمە دا بوو، فەرموودەی باسدەکرد، ( ابن عمرو ) پێی گووت: ئەگەر تۆ تەواو بوویت، ئەوا سەلام بدەوە چونکە تۆ لە نێو نوێژدای.[3]

---

(١) ( الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي لا١٠٣ ژ ٥٧ )

(٢) (المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٤٠٣ )

(٣) ( شرف اصحاب الحديث للخطيب البغدادي ١٦٦ )

عون بن عبد الله:

عونی کوڕی عبدالله دەڵێت : بە عومەری کوڕی عبدالعزیزم گووت: دەڵێن : ئەگەر توانیت ببیتە کەسێکی زانا ئەوا ببە زانا ، ئەگەریش نەتتوانی ، ئەوا ببەبە فێرخواز ، وەگەر نەتتوانی ببیتە فێرخواز ، ئەوا ئەوانت خۆشبووێ ، ئەگەر خۆشیشت نەویستن ئەوا ڕقت لێیان نەبێت، عمر فەرمووی: سبحان الله خوای تعالی دەرچەیەکی کردۆتەوە.[١]

قتاد بن دعامة: قتادة دەڵێت:

پلەو پایەی زانست ( علم ) چاکترە لە پلەو پایەی عیبادەت کردن، وە چاکترینی دینەکەتان ترسانە( واتە: ترسی نەفس لە حەڵاڵ و حەڕام لەبەر الله )[٢]

محمد بن شهاب الزهري:

پێشەوا الزهري دەڵێت: هیچ عیبادەت بۆ الله هاوشێوەی فقهـ نیە (واتە علم ).[٣]

---

(١)( العلم لزهير بن حرب ٢ )

(٢)( المدخل إلى سنن الكبرى ٤٥٧ )

(٣) ( المدخل إلى سنن الكبرى ٤٥٧ )

## فەزڵی علم لای أتباع التابعين:

مالك بن أنس:

وە لە ئیمامی مالکەوە دەفەرمویت: بەهۆی زانستەکەیان پلەیان بەرزدەکاتەوە.[١]

سفيان الثوري:

سفيان الثوري دەڵێت: نەمزانیوە لە عیبادەت کردندا شتێک هەبێت چاکتر بێت لەوەی خەڵکی خۆیان فێری زانست بکەن.[٢]

خطيب هێناویەتی لە عبد الله بن أحمد بن حنبل گووتی: گوێم لە علي بن حكيم بوو دەیگووت: گوێم لە وکیع بوو دەیگووت: سفيان ( الثوري ) هیچ شتێک نیە ترسم لێی بێت هێندەی حەدیس، وە هیچ شتێک نیە چاکتر بێت لەو بۆ یەکێک کەوا مەبەستی ڕەزامەندی الله بێت.[٣] ( شرف أصحاب الحديث للخطيب ١٦٠)

(١)( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٤٣ ).

(٢) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٧١)

(٣)( شرف أصحاب الحديث للخطيب ١٦٠)

بشر بن الحارث:

خطیب هێناویەتی لە یعقوب بن بختان القزاز گووتی: گوێم لە  بشر بن الحارث بوو دەیگووت : وانازانم لەسەر ڕووی زەوی کردەوەیەک هەبێ چاکتر بێت، لە داواکردنی زانست ( طلب العلم ) وە فەرموودە بۆ کەسێک لە الله ترس بێت ، وەنیەتی تێیدا چاك بێت، وە منیش داوای لێخۆشبوون لە الله دەکەم بۆ هەر هەنگاوێک کەوا هەنگاوم بۆی نابێت.[1]

عبدالله بن المبارك:

ابن المبارك دەڵێت : نەمزانیوە شتێك هەبێت چاکتر بێت لە هەوڵی فێر بوونی حدیث بۆئەو کەسەی نیەتی لله بێت.[2] وە گوترا بە ابن المبارك: ئەگەر پێت بڵێن یەک سەعاتت لە ژیاندا ماوە چیت دەکرد؟ فەرمووی خەڵکم فێر دەکرد.[3]

وکیع بن الجراح:

خطیب البغدادي هێناویەتی لە زکریا بن عدي گووتی: گوێم لە وکیع بوو دەیگووت: گەر بێت حەدیس لای من زۆر چاکتر نەبێ لە( تسبیح ) ئەوا بۆم باسنەدەکردن.[4]

---

(١) ( شرف اصحاب الحدیث للخطیب ١٦٣ )

(٢) (المدخل إلى سنن الکبرى للبیهقي ٣٧٢).

(٣)( المدخل إلى سنن الکبرى للبیهقي ٣٧٣ )

(٤)( شرف أصحاب الحدیث ١٦٤

خطيب البغدادي هێناویەتی لە يوسف القطان دەیگووت: گوێم لە وكيع بوو دەیگووت: ئەگەر بزانم نوێژ چاکترە لە حەدیس ئەوا فەرمووده‌م بۆتان باسنەدەکرد.[١]

**دەڵێم:** مەبەستی نوێژی سوننەتە.

خطيب البغدادي هێناویەتی لە إبراهيم بن سعيد الجوهري دەیگووت گوێم لە وكيع بن الجراح بوو دەیگووت: {ما عبد الله بشيء أفضل من الحديث}.[٢]

المعافي بن عمران: خطيب البغدادي هێناویەتی لە أبو ثوبان مزداد بن جميل البهراني گووتی: عمر بن سهيل کە یەکەکێک بوو لە هاوەڵانی حەدیس پرسیاری لە المعافى بن عمران کرد، گووتی: ئەی باوکی عمران کامیان خۆشەویسترە لای تۆ؟ نوێژبکەم یان فەرمووده بنوسمەوە؟ گووتی: نوسینەوەی تەنها یەک فەرمووده‌م لا خۆشترە لە نوێژی شەوەکە. (واتە شەو نوێژ).[٣]

(١) ( شرف أصحاب الحديث ١٦٧

(٢) (شرف أصحاب الحديث للخطيب ١٦٢ )

(٣) (شرف اصحاب الحديث للخطيب البغدادي ١٦)

پێشەوا محمد بن إدريس الشافعي:

پێشەوا الشافعي دەیگووت: هەوڵدان بۆ فێربوونی علم باشترە لە نوێژی سوننەت.[1] وە دەیفەرموو : بەندە دوای جێبەجێ کردنی فەرزەکان لەسەری هیچ شتێک وەک هەوڵی فێر بوونی علم لە الله عزوجل ی نزیک ناکاتەوە.[2]

آحمد بن حنبل الشيباني قوتابی أتباعی تابعين:

إبراهيم بن هانئ دەڵێت: بە احمد بن حنبل م گووت: کامیان لای تۆ باشترە، شەو بنوسمەوە یان شەو نوێژ بکەم؟ فەرمووی: گەر تۆ بخوێنی و بنوسیەوە ئەوا خۆت فێری دینەکەت دەکەی، ئەوەیان لام خۆشەویسترە یان باشترە.[3]

**دەڵێم:** مەبەستیان لە زانستەکانی دینە بەقورئان وعلومەکانی وە حديث و علومەکانی ئەگەر سەیر بکەن بە عیبادەتیان وەسف کردووە، چونکە پێویستی بە جهد و قوربانیە وە شەونخونی زور شتی تر بەڵێ بەدڵنیایی تاکە ڕێگای ڕاماڵینی جهل، فێربوونی علمە، علم و جهل دوو دژ بەیەکن هەردووکیان دژی یەك بەردەوام لە جەنگن.

(١) (المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٧٤).

(٢) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٧٦ )

(٣) ( الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي)

## ئەو زانستەی کە فێری بوویت لێت دەپرسرێتەوە لەسەری:

آدم بن أبي إياس العسقلاني هێناویەتی لە هاوەڵی بەڕێز ( معاذ بن جبل ) رضي الله عنه دەفەرموێت : هیچ بەندەیەك لەقیامەت هەنگاو نانێت تاوەکو پرسیاری چوار شتی لێدەکرێت، لەوانیش: (عن علمه ما عمل فيه ) واتە لەو زانستە و شارەزاییەیی لەدین بەدەستی هێناوە کاری پێکردووە؟[1]

**دەڵێم:** لەڕووی سەنەدەوە سەنەدی بێهێزە بەهۆی بوونی ( ليث بن أبي سليم ) وە رجالەکانی تری هەمووی ثقة ن، وە بە(مرفوع ) هاتووە لەڕێگای ترەوە لەوانیش: الدارمي و الترمذي هێناویانە لە أَبِي بَرْزَةَ الْأَسْلَمِيِّ رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم: چوار شت لەقیامەت لەهەموو بەندەیەك دەپرسرێتەوە لەوانیش: ئەو علمەی بەدەستی هێناوە چۆن کاری پێکردووە.

لەڕووی سەنەدەوە : ئیمامی الترمذي دەڵێت: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ،

وە لەڕێگای ترەوە هاتووە لە هاوەڵی بەڕێز ابن مسعود ئیمامی الترمذي لە سنن ٢٤١٦ بەڵام

---

(١) (العلم والحلم لآدم ١٤٦ وە ذم من لايعمل بعلمه لابن عساكر ٢ )

(٢) (الدارمي ٥٥٤ والترمذي ٢٤١٧ وأخلاق العلماء للآجري لا ٧٧ وە البيهقي لە المدخل إلى سنن الكبرى لا ٤٩٤ و اقتضاء العلم العمل للخطيب البغدادي ٢ )

سەنەدی لاوازەو ئیمامی الترمذي خۆی دەڵێت: غريب. بۆیە هاوەڵان زۆر لەوبارەوە ترساون لەو بارەوە کۆمەڵێك آثر لێیانەوە هاتوون بەو شێوە:

آدم بن إياس هێناویەتی لە هاوەڵی بەڕێز( أبو هريرة )رضي الله عنه دەفەرموێت: یەکەم شت کەوا لە ڕۆژی دوای من لێی بترسم پرسیارم دەربارەی لێبکرێت ئەوەیە بڵێن : فێری علم بوويت ، چ کارێکت بەو علمە کرد کە فێری بوويت.[1] وە هێناویەتی لە هاوەڵی بەڕێز( أبو الدرداء ) رضي الله عنه دەفەرموێت : ئەوەی لێی بترسم لە الله عزوجل ئەوەیە لەڕۆژی قیامەت لەسەرووی هەموو بوونەوەر پێم بڵێ: ئەی عویمر منیش دەڵێم : لبيك يارب پێم بفەرموێ : چ کارێکت کرد لەو زانستەی کە فێری بوويت.[2]

**دەڵێم:** دوای زانین و بینینی دەیان حديث و آثر لەسەر گەورەیی و گرنگی و واجبێتی فێربوونی زانستی شەرعی، پێویستە خوێنەر ئەوەش بزانێت و تێبگات کەوا هەر ووشەیەک کە الله عزوجل فێری دەکات لە علم لێی دەپرسیرێتەوە و لەسەری حسابە لە ڕۆژی قیامەت، واتە دوای فێربوون پێویستە لەسەرەتا خۆی کاری پێبکات و جێبەجێی بکات وە دواتر بڵاوی بکاتەوەو خەڵکی فێربکات، چونکە ئەو زانستە دەبێتە بەڵگە لەسەرت وە تۆش پێی دەبیە بەڵگە لەسەر خەڵك چونکە هیچ پێغەمبەرێک نیە نێردرابێت ئیللا دوای فێربوونی فەرمانی بانگەوازی پێکراوە.

(١) ( العلم والحلم لآدم ١٤٧ )

(٢) (العلم والحلم لآدم ١٤٨ وە الشعب الإمان للبيهقي ٢/ ٢٩٩ )

## یەك كەس هیدایەت وەرگرێ لەسەر دەستت:

وعَنْ سَهْلِ بن سعدٍ، أنَّ النَّبيَّ ﷺ قَالَ لِعَليًّ: فو اللَّهِ لأنْ يهْدِيَ اللَّه بِكَ رجُلًا واحِدًا خَيْرٌ لكَ من حُمْرِ النَّعم.[1] واتە: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت: سوێند بە الله گەر تەنها یەك كەس هیدایەت وەرگرێ لەسەر دەستت، ئەوا لەباشترین ماڵی عەرەب بۆت چاكترە. (حمر النعم ) دەڵێن: بەنرخترین ماڵی عەرەبە.

**دەڵێم:** ئەو فەرموودە بەڕیوایەتی تر هاتووە لە كتوبەكان لە كاتی جەنگی خەیبەردا، كاتێ پێغەمبەرصلى الله عليه وسلم ئاڵاكە دەدات بە ( ئیمامی علي ) بۆ ئەوەی فەتحی خەیبەر بكات، ئەویش دەفەرمووێ: چیبكەم؟ پێی دەفەرموێ: لەسەرەتا بانگەواز یان بكە بۆ ئیسلام (الخ)، ئینجا دەڵێ والله گەر تەنها یەك كەس لەسەر دەستت هیدایەت بدرێ بۆت بەنرخترە لە باشترین ماڵی دونیا. واتە بەهۆی بانگەوازەكەت كە بناغەی بانگەواز بریتیە لە علم، واتە هیچ كەسێک بەجەهل بانگ ناكرێت ئیللا دوای علم نەبێ وەك پێغەمبەران هەموویان لەسەرەتادا الله زانست و دانایی فێر كردوون ئینجا فەرمانی بانگەوازی پێكردوون، هیدایەتیش لەدەست الله عزوجل ـە بەڵام تۆ دەبیە هۆكار بۆئەوەی ئەو كەسە ڕێگای ڕاست بدۆزێتەوە، ئەوەشیان یەكێكی ترە لە پێگەو گەورەیی (علم). ئەوەی بینیتان و خوێندتانەوە لە تەفسیر و لە فەرموودە

و ئەقوالی پێشەوایانی سەلەف بەشێكی زۆر كەم بوو بگرە پووختەیەكی كورت بوو لەسەر (علم) پێگەو گرنگی و گەورەیی زانستی شەرعی، تێگەیشتین كەوا فێربوونی زانستی شەرعی لە

[1] (متفقٌ عليهِ )

توحید و حەڵاڵ و حەڕام فەرزی عەینە تاك بەتاك لەسەر هەموو موسڵمانێك، تێگەیشیتن سەلەف چۆن و بە چ شێوەیەك پێداگر بوون وە هاندەر بوون بۆ زانستی شەرعی، هەر ئەو هۆکارانەش بووەتە هۆی ئەوەی ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ژیاننامەی پێشەوایانی سەلەف و گەورە زانایانی ئوممەت دەبینین زۆرینەیان هەموو تەمەنیان لەپێناو علم و فێربوونی زانستی تەرخان کرد وە داناوە، لەحەوت ساڵی بەمنداڵی چوونەتە نێوی لەدوای حەفتا ساڵی هەندێکیان دوای بیرچوونەوە و تێکەڵ بوون ئینجا لێی دەرهاتوون، فەرموو تۆی خوێنەر گەر لەهەر پلە و پێگەو تەمەنێکی درەنگ نیە و نەبووە بۆئەوەی لەئێستاوە خۆت فێربکەی وە بەڕووناکی علم دڵت ڕووناك کەیت.

## بەشی دووەم: پێگەی زانایان لە قورئان و فەرموودە:

دوای باسکردن و دیراسەی بابی ( زانست، العلم ) لەبەرامبەریدا بابێکی تر دێتە پێش کەوا ڕێدراون بەیەك ئەویش ( زاناکان، العلماء ) چونکە باسی دەکەین پاڵپشت بە فەرموودەی صحیح کەوا ( زانست = بە زانا ) بەیارمەتی الله عز وجل هەوڵدەدەم باسی پێگەو گەورەیی زاناکان بکەم، لە قورئان و سوننەت و ئەسەری واردی سەلەفدا، دواتر جگە لە پێگەیان باس لە مەترسی کارنەکردنی زاناکان بە زانستەکەیان دەکەین بۆ ئەوەی خوێنەر دووبارە لەوە بگاتەوە ئەو دینەی لە ژێر دەستیەتی یاخوود لەسەریەتی، تاکە ڕێگای مانەوەی بۆمان زاناکان بوون ئەوان الله کردوونی بە قەڵا بۆ پاراستنی دین وە گەیاندن و مانەوەی وەك خۆی، گەر زاناکان نەبن کێ دەیزانی کام فەرموودە لاوازە و کامیان موضوعة و صحيحة، ئەگەر ئەوان قسەیان لەسەر رجالی سەنەد نەکردایە، تۆی نەزان و بێ ئاگا چۆن و بەچ شێوەیەك دەتزانی فلان ڕاوی متروکە یان متهمە یان ثقة یە! کەواتە ئامانجی ئێمە بۆ گەڕانەوەی شکۆیە بۆ ئەوانەی خاوەن شکۆ بوون، ڕێزگرتنەوەی ئەوانەی کەوا ڕێزدار بوون، وە دووبارە درووستکردنەوەی متمانەی خوێنەر بە پێشەوایان بەوەی تێبگات وە بزانێت ئەوان هیچ شتێکیان لەدین دانەهێناوە یان کەمکردبێ، بەڵکو هاتوون بە بەڵگەی وارد دەقەکانیان ڕوونکردتەوە بۆ من و تۆ ، بۆیە ناکرێ وە نابێت بەبیانووی ئەوەی قورئان و سوننەت ڕەفزی کوللی هەرچی پێشەوایە بکرێ، چونکە دەیسەلمێنین ئەوان واتە علم وە علمیش واتە دین.

لەبەرامبەر هەموو ئەوانەش پێویستە وریایی ئەو خاڵە بن: ئێمە هەرگیز معصومیەت بەهیچ پێشەوایەك نادەین و بڵێین ئەوەی گووتوویەتی تەواوە پێکاویەتی، لەگەڵێن لەو شوێنەی

لەگەڵ سوننەتە. وە مەبەستی ئێمە پێشەوایانی خير القرون و سەلەفە ئەوانەی کەوا هەڵگری حەقیقی زانستەکەیان بوون.

## پلەو پایەی زانا لە قورئاندا:

لێرەدا بەپوو ختی باس لەو فەزڵ و پلەیە دەکەم کە خوای تعالی لە قورئاندا بە کەسانی شارەزا بە ئموری دین واتە ( عالم ) بەخشیوە، بۆ ئەوەش دەگەڕێمەوە بۆ تەفسیری زانایان.

**ئایەتی یەکەم:** الله عز وجل دەفەرموویت: شَهِدَ اللَّهُ أَنَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ وَالْمَلَائِكَةُ وَأُولُو الْعِلْمِ قَائِمًا بِالْقِسْطِ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْعَزِيزُ الْحَكِيمُ (١٨)آل عمران. لە تەفسیری ئەو ئایەتەدا البغوي دەڵێت: واتای: قوله تعالى (وأولو العلم) يعني الأنبياء عليهم السلام، واتە گشت پێغەمبەران.

وقال ابن كيسان يعني: المهاجرين والأنصار.

وە ابن کیسان مەبەستی ئیمامی طاووس ە دەڵێ واتە: هاوەڵانی کۆچکار و پشتیوانان دەگرێتەوە.

وقال مقاتل: علماء مؤمني أهل الكتاب عبد الله بن سلام. وە مقاتل دەڵێت: مەبەستی زانایانی ئیمانداری ئەهلی کیتابە. لەوانیش عبد الله بن سلام و هاوەڵانیەتی.

قال السدي والكلبي:

يعني جميع علماء المؤمنين. وە هەریەك لە السدي و الكلبي دەڵێن: واتایی هەموو زانا ئیماندارەکان دەگرێتەوە.[1]

**قال الكردي:** لە تێکڕای بۆچوونەکان دەرکەوت مەبەست پێی کەسانی زانایە ئینجا لە هەموو سەدە و سەردەم و چینەکان دا والله أعلم. هەروەها ابن کثیر لە تەفسیری ئەو ئایەتە دەڵێت: ( شهد الله أنه لا إله إلا هو والملائكة وأولو العلم ) وهذه خصوصية عظيمة للعلماء في هذا المقام. ئەوە تایبەتمەندیەکی گەورەیە بۆ زانایان لەو پێگەیەدا.[2] (تفسير ابن كثير)

**ئایەتی دووەم:** يُؤْتِي الْحِكْمَةَ مَن يَشَاءُ وَمَن يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الْأَلْبَابِ (٢٦٩) البقرة. لە تەفسری ئەو ئایەتەدا ئیمامی ابن جرير دەڵێت: قوله: ( وَمَنْ يُؤْتَ الْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا )، واتە شارەزایی لە قورئاندا بە ناسخ و منسوخەوە وە بە محکم و متشابهەوە وە بەپێشین و بە پاشین وە بەحەڕام و حەلاڵیەوە، هاوشێوەی ئەوان.

**دەڵێم:** (جگە لە زانا کێی تر ئەو شتانە شارەزایە.)

---

(١) ( تفسير البغوي )

(٢) (تفسير ابن كثير )

وە هێناویەتی بەسەنەد لە:

**١- قتادة في قوله:**

" يؤتي الحكمة من يشاء "، قال: الحكمة: القرآن، والفقه في القرآن. واتە (الحكمة ) ماناى قورئانە وە تێگەیشتن لە قورئان.

**٢- عن أبي العالية:**

" ومن يؤت الحكمة فقد أوتي خيرا كثيرا ". واتە: قورئان و تێگەیشتنیەتی.

**٣- عن مجاهد قوله:**

" يؤتي الحكمة من يشاء ". ئیمامی مجاهد دەڵێت : مەبەست پێی پێغەمبەرایەتی نیە بەڵکو قورئان و زانست پێی وە تێگەیشتنیەتی.[١]

**قال الكردي:** بە تێکڕای بۆچوونی گەورە پێشەوایانی سەلەف لە تەفسیردا واتا ( زانا ) چونکە تەنها عالم ئەو تایبەتمەندییەی هەیە، خۆ ناکرێ بڵێین کەسێکی عەوام یان جاهل شارەزایە بە قورئان! ئەمەش تایبەتمەندی و پلەیەکی گەورەیە لەلایەن الله وە بۆ ( عالم ).

**ئایەتی سێیەم:** قال الله تعالى: [ يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ ]، لەتەفسیری ئەو ئایەتەدا هاوەڵی بەڕێز حبر البحر عبدالله بن عباس دەفەرمووێت: قال الدارمي

---

(١) [ تفسير الطبري و فرض طلب العلم للآجري لا ١٩]

أَخْبَرَنَا عَبْدُ اللَّهِ بْنُ يَزِيدَ ، حَدَّثَنَا حَيْوَةُ ، قَالَ : أَخْبَرَنِي السَّكَنُ بْنُ أَبِي كَرِيمَةَ ، عَنْ عِكْرِمَةَ مَوْلَى ابْنِ عَبَّاسٍ، عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ : { يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ }. قَالَ : يَرْفَعُ اللَّهُ الَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ عَلَى الَّذِينَ آمَنُوا بِدَرَجَاتٍ. واته الله عزوجل پلەی ئەوانەی خاوەن علم و شارەزاین بەدین لەسەر ئیمانداران بەرزتر دەکاتەوە (بەچەندان پلە )[1]

**دەڵێم:** واته( عالم ) چونکه تەنها کەسی زانا الله عزوجل فەزڵی پێداوە لەزانست و زانیاریدا.

**ئایەتی چوارەم:** قال الله تعالى : [ وَتِلْكَ الْأَمْثَالُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ وَمَا يَعْقِلُهَا إِلَّا الْعَالِمُونَ (٤٣) العنكبوت. ئیمامی ابن أبي حاتم لەتەفسیر هێناویەتی: له عمرو بن مرة دەفەرموێت: بەلای هەر ئایەتێک له قورئانی پیرۆزدا تێپەر بوبم و لێی تێنەگەیشتبم یان نەمزانیبێت ئیللا دڵتەنگی و خەم دایگرتووم، چونکه خوای تعالى دەفەرموێت: ( وتلك الأمثال نضربها للناس وما يعقلها إلا العالمون )

ئایەتی {ولكن كونوا ربانيين} آل عمران ٧٩: له تەفسیری ئەو ئایەته دا پێشەوایانی تەفسیر دەڵێن واتای ( ربانيين ) واته فقهاء یان علماء بەم شێوەیە: هەریەك له ابن جرير وە ابن أبي حاتم هێناویانه له الضحاك له ( ابن عباس) دەفەرموێت: {ربانيين}: علماء فقهاء.[2] وە بەهەمان شێوە ابن أبي حاتم هێناویەتی له سعيد بن جبير له هاوەڵی بەرێز ابن عباس

(١) ( سنن الدارمي ٣٦٥ مقدمة )

(٢) (الدرر المنثور ).

رضي الله عنهما لەبارەی ئەم ئایەتەدا {ربانيين} دەڵێت واتا: فقهاء معلمين. وە هەریەك لە ابن جرير وەابن المنذر وە ابن أبي حاتم هێناویانە لەڕێگای عكرمة لە ابن عباس لەبارەیی ئەو ئایەتەدا {ربانيين} دەفەرموێت واتایی: حلماء علماء حكماء. [لێرەدا ماناكەی فراوانتر بوو ]، وە ابن المنذر هێناویەتی لەهاوەڵی بەڕێز ابن مسعود رضي الله عنه لەبارەیی ئەو ئایەتە {ربانيين} دەفەرموێ : حكماء علماء.[1] ئەوە تخريجی تەفسیری ئەو ووشە لە وئایەتە بوو لە سورەتی آل عمران ٧٩ لە الدرر المنثور للسيوطي. بەهەمان شێوە ئێمامی ابن جرير لە تفسير لەبارەی ئەم ئایەتە هێناویەتی لەهەریەك لە: أبي رزين، الحسن البصري، مجاهد بن جبر، قتادة بن دعامة، السدي ، الضحاك، يحي بن عقيل دەڵێن واتایی: ( فقهاء و علماء وحكماء ) لەهەموو حاڵەكاندا وەك ابن جرير يش هەڵیبژاردووە، ئەو كەسانەدەگرێتەوە كەوا ئیصلاحی خەڵك دەكەن لە ولاة الأمور و فقهاء و علماء. وەك معلومە زانایان ئەو چینەن كەوا بەهۆی زانستەكەیان خەڵك ی جاهل لە تاریكی جهل ڕزگار دەكەن وە فقهاء يش بەهەمان شێوە.

**ئایەتی پێنجەم:** الله عزوجل دەفەرموێت : كَذَلِكَ إِنَّمَا يَخْشَى اللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ الْعُلَمَاءُ إِنَّ اللَّهَ عَزِيزٌ غَفُورٌ [فاطر:٢٨]

**دەڵێم:** لە تێكڕایی ئەو ئایەتانەی باسمان كرد بەشێوەیەكی ڕاستەوخۆ باسی كەسی( عالم ) دەكات وە پێشەوایانی تەفسیریش بەو شێوەیان لێكداوەتەوە، جگە لەو ئایەتانە چەندان

---

(١) ( الدرر المنثور ).

ئایەتی ترمان هەیە بەناڕاستەوخۆ باسی دەكات، بەڵام بۆ خوێنەری موسڵمان ئەوە كافیە تاوەكو تێبگات زانای موسڵمانی ملتزمی متقی لە قورئاندا چۆن وەسف كراوە چۆنیش پلەیان پێدراوە. **هاوكات خاڵێكی گرنگ:** (وەك لە پێشەوە باسمان كرد ئەو ئیمامانەی هەڵگری علمەكەیان بوون وە كاریان پێكرد نەك زانایەك كاری پێنەكردبێت.)

## پلەو پایەیی زانایان لە حدیثدا:

بۆ سەلماندنی ڕاستی ئەوەی كەوا ( زانا ) چ ڕێز و پلەیەكی هەیە لە دینی ئیسلامدا دوای قورئان دەگەڕێینەوە بۆ سوونەتی سەروەر صلى الله عليه وسلم لەچەندان فەرمووده بەشێوەی ڕاستەو رسول الله باسی گەورەیی و پلەی ( زانا ) ی كردووە بەم شێوەی خوارەوە:

زاناكان واتە زانست (علم )وە علمیش واتە دین: عَنْ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عَمْرِو بْنِ الْعَاصِ (رضي الله عنه) قالَ: سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ (صلى الله عليه وسلم) يَقُولُ: (إِنَّ اللَّهَ لَا يَقْبِضُ الْعِلْمَ انْتِزَاعًا يَنْتَزِعُهُ مِنَ النَّاسِ، وَلَكِنْ يَقْبِضُ الْعِلْمَ بِقَبْضِ الْعُلَمَاءِ، حَتَّى إِذَا لَمْ يَتْرُكْ عَالِمًا اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا، فَسُئِلُوا فَأَفْتَوْا بِغَيْرِ عِلْمٍ، فَضَلُّوا وَأَضَلُّوا). واتە: (عبداللە) كوڕی (عمر) كوڕی (عاص) (خوای لێ ڕازی بێت) دەڵێ: بیستومە لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) دەیفەرموو: (بەڕاستی خوای گەورە علم و زانیاری لەخەڵكی وەرناگرێتەوە بەوەرگرتنەوە، بەڵكو علم و زانیاری وەردەگرێتەوە بەوەرگرتنی زانایان، واتە بە مراندنیان ئەگەر زانا نەما ئەوا خەڵكی چەند سەرۆكێكی نەزان هەڵدەبژێرن بۆ خۆیان، پرسیاریان لێدەكەن ئەوانیش فتوا

دەدەن بەبێ عیلم و زانیاری، خۆیان گومڕا دەبن و خەڵکیش گومڕا دەکەن).[١] وە لەڕیوایەتێک دەڵێت: تاوەکو هیچ زانایەك نامێنێت، ئینجا خەڵکی کەسانی جاهل دەکەن بە ڕێنیشاندەر و پێشەوای خۆیان خۆیان گومڕان خەڵکیش گومڕا دەکەن. بۆیە هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێت : وای لێدێ لە قەومێك یان عەشیرەتێک تەنها دوو زانا دەبێت، یەکێکیان دەمرێ، نیوەی زانستەکەی لەگەڵ خۆی دەبات، ئەویتریان دەمرێت و زانستەکەی هەمووی لەگەڵ خۆی دەبات.[٢]

**دەڵێم:** ئەو فەرموودە مشهورە صحیحة یەکێکە لە گرنگترین ئەو فەرموودانەی کەوا پلەیەکی تایبەت و گەورە دەبەخشێت بە ( عالم ) واتە هەڵگرانی، لەو فەرموودەیە بۆمان دەردەکەوێ کە ( العلم واته العلماء ) هەرکاتێک زاناکان نەمان ئەوا علم نامێنێت چونکە بەنەمانی کەسانی زانا و شارەزا بە ئموری دین ڕێگا بۆ کەسانی جاهل و نەزان دەرەخسێت تاوەکو بێنە مەیدان، وەك رسول الله دەفەرموێ: دوای نەمانی زاناکان ئەوکات خەڵك چیدەکات [ اتَّخَذَ النَّاسُ رُءُوسًا جُهَّالًا ]. واتە کەسانێکی جاهل و نەزان بە بەدین و ئموردی دین هەڵدەبژێرن

(١) ( البخاري ١٠٠ ومسلم ٢٦٧٣ و الترمذي ٢٦٥٢ وابن ماجه ٥٢ والدارمي ٢٤٥ وأحمد ٦٥١١ و أخلاق العلماء للآجري ٣٣ وفرض طلب العلم للآجري ٥٦,٥٧,٥٨ ).

(٢)( فرض طلب العلم للآجري ٥٩ و والطبراني في الكبير ٨٩٩١/٩ وه الخطيب في الفقيه والمتفقه ١٤٧ و أخلاق العلماء للآجري ٢٣وه العلم والحلم لآدم ١١٠)

و دەیکەنە قدوەی خۆیان و دەچن پرسیاریان لێدەکەن ئەوانیش جاهلن نەزانن. وە چۆن خۆیان گومڕابوون خەڵکیش بەرەو گومڕایی پەلکێش دەکەن، کەواتە: لێدان لە زاناکان لێدانە لە دین و علم لێدانە لە تێکڕایی علومەکانی دین، هەرکاتێکیش زاناکان نەمان ئەوکات نەزان چاوی خەڵك کوێرەکەن.

**محمد بن الحسين الآجري دەفەرموێت:**

ئەگەر گووترا مەبەست چیە لەو فەرموودەیە؟ ئەوا پێیان دەڵێین والله أعلم.

هەر کات سەردەمەکەی خەراپ بوو، وە خەراپ بوونەکەشی مانای خەراپ بوونی خەڵکەکەیەتی، بەمەش خەڵکەکەی پشت لە فێربوونی علم دەکەن، وە زانست لەنێویان دا کەمدەبێتەوە، بەمەش ( زاناکانیان لەنێو دا ناهێڵێت ) ئەو زانایانەی کەوا خوای تعالی سوودی پێگەیاندوون بە زانستیان، وە حەق خۆشیان پێداوە و بەو هۆیەوە الله عز وجل کردوونی بە هۆی سوودگەیاندن بە خەڵکانێکی زۆر، وەکاتێك ئەو زانایانە نەمێنن .... کۆمەڵانێك کە لە زانست نازانن وە نەشیان پاراستوە و هیچ شتێک لە ئەحکام نازانن، بەڕووکەش خۆیان بەئەهلی علم دادەنێن کە لە ڕاستی دا لە جهل و نەزانی نزیکترن ،کاتێک یەکێکیان پرسیاری شتێکی لێدەکرێت ئەویش نایزانێت، بەڵام پێی شەرمە یان پێی ناخۆشە بڵێت ( نازانم) چونکە پلەی لای خەڵکیدا کەمدەبێتەوە، بۆیە بەبێ علم فتوا دەدا، بەمەش حەڕامی الله حەڵاڵ دەکاو بەپێچەوانەوە ، بە مەش لەڕێگای ڕاست گومڕایان دەکات ، وە ئەوەی شوێنی بکەوێت لەو شتەدا تێدەچێ ...[1]

(١) ( فرض طلب العلم للآجري )

**دەڵێم:** سبحان الله ئەو زانا بەڕێز نزیکی سەردەمی سەلەف بووە و لەوان ئەژمار دەکرێت، ئەو دەڵێت ئێستا ئەو شتە لەو سەردەمە زۆرە ، (فکیف بۆ ١١٠٠ ساڵ دواتر کە ئێستایە )، بەڵێ ئێستا دەبینین زانای سەرڕاست و هەڵگری حەقیقی زانستەکەی نەماون و کەم بوون،

بەهەمان شێوە خەڵکەی بەهەمەموو شێوەیەك پشتیان لە فێربوونی علم کردووە و نایانەوێت فێربن بۆیە تەنانەت ڕقیان لە ئەهلی علمە ئەگەر بێت و هەبێت، هەروەها کۆمەڵانێکی جاهل هەن کەوا دوورن لە علم و ئموری دین بەڵام بەڕووکەش خۆیان داوەتە پاڵ علم خەڵکیش بەهۆی جەهلی خۆیان و بێ ئاگاییان لە زانستەکانی دین بە قدوەی داناون، ڕێک ئەوەیە ئەو پێشەوایە باسی دەکات، چەند زۆرن ئەو جاهلانەی کەوا وەڵامی هەموو پرسیار و باسێک دەدەنەوە چونکە پێیان ناخۆشە بەخەڵکی بڵێن: ( نازانین ) چونکە خەڵکەکەش پێیان سەیردەبێت پرسیار لەکەسێک بکرێت و بڵێت نازانم! ئەوە نابێت. بۆیە وەك لە فەرموودەکان هاتوون بەهۆی بێ علمی خۆیان خۆیان و خەڵکیش بەرەو گومڕایی دەبەن. ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ سەردەمی خیر القرون دەبینین ڕێک پێچەوانەیە ئەوان دەیان گووت ( لا أدري نصف العلم ) قتادة دەیگووت: سی ساڵە فتوام بێ علم نەداوە، ئیمامی مالك لە نزیکەی چل پرسیار وەڵامی چواری داوەو ئەوانی تر گووتی: نایزانم.

## طائفة المنصورة، ئەهلی علم و حدیث:

رسول الله صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: بەردەوام كۆمەڵێک لە ئوممەتەكەم لەسەر حەقن یان دەمێنن لەسەر حەق یان دەجەنگن لەپێناو حەق، وە ئەوانەی دژایەتیان ئەكەن هیچ زیانێکیان پێناگەیەنن تا هەڵسانی قیامەت بەردەوامن.

ئەم فەرموودە كۆمەڵێك هاوەڵ ڕیوایەتیان كردووە ئەوانیش: ( المغيرة بن شعبة رضي الله عنه، جابر بن سمرة رضي الله عنه، عقبة بن عامر رضي الله عنه، عمران بن حصين رضي الله عنه، عمر بن الخطاب رضي الله عنه. بەچەند لفظ ێكی جیاواز هاتووە. (مەبەست لەوەیە گەرچی دژایەتیەكی زۆر بكرێن بەڵام ئەوان هەر كۆڵنادەن و بەردەوام دەبن.)

**قال الكردي:** مەبەست لەو كۆمەڵە كێن وە كێ دەچێتە چوارچێوەی:

١- قَالَ مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ : قَالَ عَلِيُّ بْنُ الْمَدِينِيّ : هُمْ أَصْحَابُ الْحَدِيثِ[(٢)] واتە: ئیمامی أبو عیسی الترمذي دەڵێت: ئیمامی البخاري ئەویش لە علي ابن المديني یەوە گووتویەتی: مەبەست بەو فەرموودەیە ( هاوەڵانی فەرموودەن ) واتە زاناكانی حدیث.

---

(١) (البخاري : ٣١١٦و مسلم ١٠٣٧و ابن ماجه ٢٢١ والموطأ ٢٦٢٧ و ابن حبان في كتاب العلم ٦٩ والخطيب في شرف أصحاب الحديث،والطبراني ٢٠/٩٥٩" و"٩٦٠" والفقيه والمتفقه للخطيب ١١٥ )

(٢) ( سنن الترمذي ٢١٩٢ ).

٢- يزيد بن هارون دەڵێت:

ئەگەر هاوەڵانی فەرموودە نەبن نازانم کێن، واتە زاناکانی حديث[١]

٣- عبد الله بن مبارك دەڵێت:

ئەوان لای من هاوەڵانی فەرموودەن، واتە زانایانی فەرموودە.[٢]

٤- آحمد بن حنبل: خطيب هێناویەتی لە : الفضل بن زياد: سمعت أحمد بن حنبل، وذكر حديث: «لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق» ، فقال: إن لم يكونوا أصحاب الحديث فلا أدري من هم؟ واتە ئیمامی ئەحمەد لەبارەی ئەو فەرموودەیە دەڵێت: ئەگەر هاوەڵانی فەرموودە نەبن ئیدی نازانم کێن؟[٣]

٥- أحمد بن سنان: دەڵێت ئەوان لای من ئەهلی علم و آثرن، واتە زاناکانن.[٤]

(١) شرف أصحاب الحديث للخطيب، باب قوله صلى الله عليه وسلم: «لا تزال طائفة من أمتي على الحق، لا يضرهم من خذلهم»

(٢) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٣) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٤) هەمان سەرچاوەی پێشوو

٦- محمد بن إسماعيل البخاري دەڵێت: ئەوان ئەهلی فەرموودەن، واتا زانایان.[(١)]

**کەواتە:** بە گەڕانەوەمان بۆ تەفسیر و لێکدانەوەی گەورە پێشەوایانی سەلەف ئەوەمان بۆ ڕوون بوویەوە زاناکانن وە هەڵگرانی علم، ئەوەشیان یەکێکە لەو پلەو تایبەتمەندییانەی کەوا بە فەرموودەی ڕاستەوخۆ دراوە بە هەڵگرانی علم و حدیث و پێشەوایانی ئوممەت لە سەلەف تاوەکو پێش قیامەت.

## فەزڵی زانا بەسەر عابد، دیراسەی فەرموودەکان کە لەسەری هاتوون ئەوانیش:

١- ئیمامی الترمذي بۆی باسکردین مُحَمَّدُ بْنُ عَبْدِ الْأَعْلَى الصَّنْعَانِيُّ ، گووتی: بۆی باسکردین سَلَمَةُ بْنُ رَجَاءٍ، گووتی: بۆی باسکردین الْوَلِيدُ بْنُ جَمِيلٍ، گووتی: بۆی باسکردین الْقَاسِمُ أَبُو عَبْدِ الرَّحْمَنِ، لە أَبِي أُمَامَةَ الْبَاهِلِيِّ دەڵێت: لای رسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ باسی دوو پیاو کرا یەکێکیان [ عابد ] ئەویتریان [ عالم ] رسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فەرمووی: پلەو پایەیی زانا بەسەر عابد وەکو پلەو پایەیی منە بەسەر نزمترینتان، ئینجا فەرمووی : اللّٰه تعالى و مەلائیکە وە ئەهلی ئاسمانەکان و زەویەکەکان وەتەنانەت مێرووله لە کونەکەی خۆیدا وە نەهەنگیش سەڵاواتی خێر بۆ زانا یان فێرکەری خەڵك دەنێرن.[(١)]

---

(١) هەمان سەرچاوەی پێشوو

(٢) (سنن الترمذي ٢٦٨٥ وە الخطيب في الفقيه والمتفقة ١٠٧/١ حديث ٦٢ )

خطيب البغدادي لەژێر ئەم ریوایەتە دەڵێت: گووتم عیبادەت درووست و تەواو نابێت ئیللا دوای تێگەیشتن لەدین نەبێت.

**قال الكردي:** لەرووی سەنەدەوە ئیمامی أبو عیسی الترمذي دەڵێت: هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ صَحِيحٌ غَرِيبٌ. واتە: تصحیحي کردووە وە لە معاصرین محمد بن صبحي وە ئەلباني، بەڵام [ الْوَلِيدُ بْنُ جَمِيل ] (فيه مقال ) هەریەك لە علي ابن المديني و أبو داود السجستاني و ابن حبان، دەڵێن: ( ليس به بأس ). وە أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي دەڵێن: شيخ. وە [ سَلَمَةُ بْنُ رَجَاءٍ ] ( فيه مقال )، أبو حاتم الرازي دەڵێت : ما بحديثه بأس. وأبو زرعة الرازي دەڵێت: صدوق. وابن حبان: ذكره في الثقات. وە النسائي لە ( الضعفاء ) دەڵێت: ضعيف. وە ابن معين دەڵێت: ليس بشيء. وە ابن عدي دەڵێت: أحاديثه افراد وغرائب.

وە ئیمامی الترمذي دەڵێت : گوێم لە أَبَا عَمَّارٍ الْحُسَيْنَ بْنَ حُرَيْثٍ الْخُزَاعِي بوو دەیگووت : گوێم لە الْفُضَيْلَ بْنَ عِيَاضٍ دەیگووت: زاناو هەڵگر و فێرکەر ، زۆرێک دووعای بۆ دەکەن لە ( مَلَكُوتِ السَّمَاوَات).

**دەڵێم:** ئەو فەرموودە بە ریوایەتی تر هاتووە بەو شێوە:

٢- آدم بن أبي إياس هێناویەتی لە أبي سعيد الخدري دەڵێت : رسول الله صلى الله عليه وسلم گووتی : « پلەو پایەیی زانا بەرامبەر بە عابد وەکو فەزڵی من وایە بەسەر ئوممەتەکەم.

(العلم والحلم لآدم ١١٢ وە مسند الحارث ( كتاب العلم ) (باب فضل العلماء ٣٩،وە ابن عبدالبر في الجامع بيان اخذ العلم وفصله ، باب تفضيل العلم على العبادة ٩٢ وە المجروحين ١/٣٤٠ وە العلل المتناهية لإبن الجوزي جـ ١ لا ٦٩ حديث ٧٩.)

**قال الكردي:** لەڕووی سەنەدەوە رجالەکانی ( محمد بن الفضل ) كذاب. وە [ زيد العمى ] (فيه مقال وضعفه بعض) ئیمامی ئەحمد دەڵێت: صالح. أبو بكر البزار دەڵێت: صالح. الدارقطني دەڵێت: صالح.

يحيى بن معين جارێك دەڵێ لا شيء، وە جارێکیش دەڵێ: صالح، وە جارێکیش دەڵێت : يكتب حديثه وهو ضعيف وە علي ابن المديني و أبو حاتم الرازي وأبو زرعة الرازي دەڵێن: ضعيف، وە بەهەمان شێوە أبو داود و النسائي. ابن الجوزي دەڵێت: هذا حديث لا يصح وسلام الطويل مجمع على تضعيفه قال النسائي والدارقطني هو مكذوب. واتە ئەو فەرموودە صحيح نیە وە( سلام الطويل ) ئیجماع هەیە لەسەر بەلاوازدانانی هەریەك لە النسائي والدارقطني دەڵێن: درۆزنە.[1]

٣ - وە بەڕێگای تر هاتووە لە أنس بن مالك رضي الله عنه دەفەرموێت: پلەوپایەیی کەسی زانا بەرامبەر عابد وەك پلەو پایەیی پێغەمبەرە بەسەر ئوممەتەکەیەوە.[2]

---

(١) ( العلل المتناهية لإبن الجوزي جـ ١ لا ٦٩ حديث ٧٩.)

(٢)( العلل المتناهية لإبن الجوزي جـ ١ لا ٦٩ حديث ٨٠ )

ابن الجوزي دەڵێت: هذا حديث لا يصح قال يحيى بن معين سليمان بن أبي سلمة ليس بشيء وقال النسائي متروك الحديث وأما البزري فكذاب. واتە : ئەو فەرموودە صحيح نيە و ثابت نەبووە لەپێغەمەرەوەبەو ڕیوایەتە، بەهۆی (سليمان بن أبي سلمة ) کەوا (يحيى بن معين ) دەڵێت: ليس بشيء . توندترین جرحە لای ئەو. وە النسائي دەڵێ: متروك. وە البزري: كذاب قاله ابن الجوزي.[1]

ابن عبد البر لەژێر ئەو ڕیوایەتە دەڵێت: ئەهلی علم بەگشتی لە فضائل دا متساهلتربوون وە ڕیوایەتیان لەهەموو کەسێک کردووە، وە توندی ئەوان لە فەرموودەکانی ئەحکام بووە.

**دەڵێم:** قسەکەی ڕاستە بەڵام واتایی ئەوە ناگەیەنێت فەرموودەی هەموو ڕاویەك مقبول بێت، چونکە پێشەوایان هەندێکجار تەنها وەك اعتبار وە بۆ زانین ڕیوایەتیان کردووە چونکە لەوبابەی ئەوان دایانناوە جگە لەو ڕیوایەتە ڕیوایەتی تری صحیح نەبووە. هەروەها دەبینین زانایان ئەو فەرموودەیان لە ژێر چ بابێکدا هێناوە (باب فضل العلماء ) واتە: پلەو پایەیی زاناکان یان باب تفضيل العلم على العبادة. بۆیەئەگەر لەڕووی سەنەدەوە کێشەیان هەبێ ئەوا لەڕووی ماناوە تەواوە چونکە گومان لەوە نیە فەزڵی کەسێکی زانا زۆر زیاترە بەسەر کەسێکی تر.

(١) ( العلل المتناهية لإبن الجوزي جـ ١ لا ٦٩ حديث ٨٠ )

(٢) (ابن عبدالبر في الجامع بيان اخذ العلم وفضله ، باب تفضيل العلم على العبادة ٩٣)

## زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن:

ئیمامی البخاري لە صحيح البخاري لە كتاب العلم بابێکی داناوە بەناوی بَابٌ : الْعِلْمُ قَبْلَ الْقَوْلِ وَالْعَمَلِ لِقَوْلِ اللَّهِ تَعَالَى : { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ }. فَبَدَأَ بِالْعِلْمِ. واتە: زانست پێش قسەو کردەوەیە وە ئایەتی : { فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ }. وە دەڵێت: خوای تعالی لەسەرەتا بە ( علم ) دەستی پێکردووە، ئینجا دواتر ئەو فەرموودەیی هێناوە (وَأَنَّ الْعُلَمَاءَ هُمْ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاءِ) واتە: زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن.

**دیراسەی فەرموودەی ( العلماء ورثة الأنبياء ):** یەکێک لە فەرموودە مشهور وناسراوەکانی نێو موسڵمانان بە عەوام و زاناکانیشەوە لە کۆن و نوێیەوە ، واتە لە سەردەمی سەلەف تاوەکو ئێستا فەرموودەی (( الْعُلَمَاءَ وَرَثَةُ الْأَنْبِيَاء). نصي فەرموودەکە بەو شێوەیە: قيس بن كثير دەڵێت: پیاوێك لە مەدینەوە هات بۆ لای هاوەڵی بەڕێز أبو الدرداء، أبو الدرداء ئەوکات لە دیمەشق بوو پێی گووت: بۆچ شتێک هاتووی براکەم؟ گووتی فەرموودەیەك پێم گەیشتووە تۆ لە رَسُول اللَّه صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم وە دەیگێڕیتەوە، پێی گووت بۆ هیچ پێویستیەکی تر نەهاتووی؟ گووتی نەخێر، وە بۆ بازرگانیش؟ گووتی نەخێر بۆ ئەویش نەهاتووم، پێی گووت: بۆ هیچ شتێک نەهاتووی تەنها داواکردنی ئەو فەرموودەیە نەبێت؟ گووتی من گوێم لە رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّم بوو دەیفەرموو: هەریەکێ ڕێگایەک بگرێتە بەر تەنها بۆ داواکردنی زانست بێت ئەوا الله عزوجل ڕێگای بەهەشتی بۆ ئاسان دەکات، وە مەلائیکە باڵەکانی ڕایەخا بۆ ئاسودەی قوتابی زانست وە زاناکان هەموو شتێ داوای لێخۆشبوونیان بۆ ئەکات لە ئاسمانەکان و زەویا تەنانەت نەهەنگ لەنێو ئاویشدا، وە پلەو پایەیی زاناکان بەرامبەر کەسی

عابد وەکو پلەی مانگە بەسەر تێکرای ئەستێرەکانی تردا، وە ( زاناکان میراتگری پێغەمبەرانن)، وە پێغەمبەرانیش هیچ میراتێکیان نەلەدینار نەلەدرهم نیە و جێناهێڵن ، تەنها ( علم ) نەبێت.[(١)]

**دیراسەی سنەدی فەرموودەی ( العلماء ورثة الأنبياء )، تحقيق:** ئیمامی الترمذي دەڵێت: نەمزانیوە ئەو فەرموودەیە جگە لە عاصم بن رجاء بن حيوة فەرموودەی کەسی تر بێت وە دەڵێت ئەوە لای من بەو شێوەیە متصل نیە، واتە: ڕیوایەتی محمود بن خداش، بەو شێوەیە : حَدَّثَنَا مَحْمُودُ بْنُ خِدَاشٍ الْبَغْدَادِيُّ، قَالَ : حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الْوَاسِطِيُّ ، قَالَ : حَدَّثنَا عَاصِمُ بْنُ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ ، عَنْ قَيْسِ بْنِ كَثِيرٍ قَالَ: دواتر دەڵێت: وە ئەو فەرموودەیە ڕیوایەتکراوە لە عَاصِمِ بْنِ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ، عَنِ الْوَلِيدِ بْنِ جَمِيلٍ، عَنْ كَثِيرِ بْنِ قَيْسٍ، عَنْ أَبِي الدَّرْدَاءِ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، وَهَذَا أَصَحُّ مِنْ حَدِيثِ مَحْمُودِ بْنِ خِدَاشٍ، وَرَأَى مُحَمَّدُ بْنُ إِسْمَاعِيلَ هَذَا أَصَحَّ.

---

(١)(أبو داود "٣٦٤١" له كتاب العلم، وابن ماجة "٢٢٣" له المقدمة: باب فضل العلماء والحث على طلب العلم، والدارمي ٣٥٤، و احمد ٢١٧١٥ والترمذي٢٩٤٥وه ابن عبد البر له"جامع بيان العلم" باب ذكر حديث أبي الدرداء ١٦٩و ١٧٣، ١٧٤،١٧٦،١٧٥ وابن حبان في صحيحه كتاب العلم ٨٨ و أخلاق العلماء للآجري لا ٢٢,٢٣و فرض طلب العلم للآجري ٢٥,٢٦ و الخطيب في الرحلة إلى طلب الحديث ٧٧,٧٨ و في الفقيه والمتفقه وه العلم والحلم لآدم ١٤٠ ، وه العلل التناهية ٨١.)

**دەڵێم:** لێرده ئیمامی الترمذي ریوایەتی: عاصم عن الولید عن كثیر ی هەڵبژاردووە وە دەڵێت: هذا أصح و محمد بن إسماعیل یش وای دەبینی ئەو ڕیوایەتە ڕاستر بێت.[1]

**قال الكردي:** دەربڕینی ئەو ووشە ( هذا أصح یان أشبه ) لەلایەن پێشەوایانی الجرح والتعدیل مانای ئەوەناگەیەنێت كەوا ئەو فەرموودەیە بە صحیح دابنرێ، ئینجا هەر فەرموودەیەك بێ بەتایبەت ئەگەر لەنێوان ( ضعیف و ضعیف ) تر بێت، لێرەدا مەبەستیان لەوەیە ڕیوایەتی ( عاصم عن الولید عن كثیر ) ڕاسترە لە ڕیوایەتی (مَحْمُودُ بْنُ خِدَاشٍ الْبَغْدَادِيُّ ، قَالَ: حَدَّثَنَا مُحَمَّدُ بْنُ يَزِيدَ الْوَاسِطِيُّ ، قَالَ : حَدَّثَنَا عَاصِمُ بْنُ رَجَاءِ بْنِ حَيْوَةَ ، عَنْ قَيْسِ بْنِ كَثِيرٍ ) گەرچی لێرەدا ئیمامی الترمذي ڕاستەوخۆ تضعیفی ئەو فەرموودەیەی نەكردووە، چونكە لە بواری ( فضائل ) ـە كە زانایان متساهلتر بوون تێیدا.

**هەروەها هەموو ڕیوایەتەكان دەچێتەوە سەر:**

١- ( قَيْسِ بْنِ كَثِيرٍ ) كەوا فیه مقال. ابن عبدالبر دەڵێت: وأما كثیر بن قیس فروى عن أبي الدرداء و ابن عمر وسمع منهما.[2]

---

(١) (سنن الترمذي ٢٦٨٢).

(٢) (جامع بيان العلم ١٧٢)

**دەڵێم:** لێرەدا ابن عبد البر جرح ی نەکردووە بەڵکو شبهەی جهالەتیشی لەسەر لابرد بەوەی ڕیوایەتی لە ابن عمر وابي الدرداء کردووە. بەڵام ئیمامی الدارقطني: دەڵێت ضعیف. وە ابن حجر لە ( التقریب التهذیب ) دەڵێت: ضعیف. وە ابن حبان لە الثقات هێناویەتی، وە مەرج نیە ئەوەی ابن حبان لە کتابی ( الثقات ) بیهێنێت تەواو کەسێکی ثقة بێت.

٢- وە [ الْوَلِيدُ بْنُ جَمِيل ] (فيه مقال): هەریەك لە علي ابن المديني و أبو داود السجستاني و ابن حبان دەڵێن: ( ليس به بأس )، وە أبو حاتم الرازي و أبو زرعة الرازي دەڵێن: شيخ.

٣- وعاصم بن رجاء بن حيوة : زانایان بەو شێوە قسەیان لەسەر کردووە: أبو زرعة الرازي دەڵێت: لا بأس به. يحيى بن معين دەڵێت: صويلح. ابن عبد البر الأندلسي دەڵێت: ثقة مشهور.[(١)] بەڵام الدارقطني دەڵێت: ضعيف. وە لە متأخرين ابن حجر العسقلاني لە التقريب دەڵێ: صدوق يهم.

ئەوە ووتەی زانایانی ( الجرح والتعديل ) بوو لەسەر ئەو سێ ڕاویە ئەمەش ئەو ڕیوایەتەیە کەوا هەریەك: لە ئیمامی أبو عيسى الترمذي وە ئیمامی محمد بن إسماعيل البخاري، هەڵیان بژاردووە بەسەر تێکڕای ڕیوایەت و ڕێگاکان ئەو فەرموودەیە، واتە ئەوان ئەو ڕێگەیان پێ صحيحة کە لەسەرەوە باسمان کرد. وە ئەو فەرموودەیە بەڕێگای تریش هاتووە لە (عاصم بن رجاء عن داود بن جميل عن قيس بن كثير) کە هەریەك لە: ئیمامی أبوداود لە سنن

(١)(جامع بيان العلم ١٧٢).

و الدارمي لە سنن وە ابن ماجە لە سنن هێناویانە،بەڵام ( داود بن جميل ) ( مجهول ) ە، هەریەك لە أبو الحسن الدارقطني و ابن عبد البر و أبو الفتح الأزدي و ابن حجر دەڵێن: (مجهول ). كەواتە ئەو ڕیوایەتەش بەو ڕێگەیە ( ضعيفة ).

**ئەو زانایانەی ئەو فەرموودەیان بە ( صحيح ) یان ( حسن )داناوە لە سەلەف و خەلەف دا ئەوانیش بریتین لە:**

١- أبو داود السجستاني:

بێدەنگ بووە لێی، گەرگی بێدەنگ بوونی مانای صحەتی نابەخشێت، بەڵام مانای وایە ئەو فەرموودە لەو بابە بەو سەنەدا كە هەڵیبژاردووە لەوانی تر چاكترە.

٢- الحاكم و أبو حاتم البستي، ابن حبان:

چونكە لە مەنهەجی ئەو دا مجهول ڕیوایەتی مقبولە.

٣- حمزة بن محمد:

شێخی شیوخەكانی ابن عبدالبر ە، ڕیوایەتێكی كردووە دەڵێت: وهو حديث حسن غريب.

٤- وه ابن عبدالبر، له جامع بيان العلم.

٥- له متأخرين ابن حجر له( فتح الباري ) له شەرحی كتاب العلم، مقدمەی باب العلم قبل القول والعمل. به حسن ی داناوه بەهۆی شواهد.

٦- السخاوي له  المقاصد الحسنة ٧٠٣ به حسن ی داناوه.

**لەزانایانی سەردەم كه لەسەر مەنهەجی سەلەفن لەوانیش:**

٧ / مصطفى العدوي دەڵێت: حسن.

٨ / عبدالعزيز الطريفي دەڵێت : حسن.

ابن الجوزي دەڵێت: قال ابن حبان وقد روى العلماء ورثة الأنبياء بأسانيد صالحة. واته ابن حبان دەڵێ: فەرموودەی العلماء ورثة الأنبياء به سەنەدی باش ڕیوایەت كراوه.[(١)]

**لەكۆتاییدا دەڵێم:** دوای دیراسەی ئەو فەرموودە مشهوره ، منیش خۆم كه لەسەر ڕێچكەی المتقدمينم، ئەو فەرموودەیەم پێ ( حسن ) ـه، ئەو یش بەهۆی استدلالی زانایان پێوەی وەك بینیمان ئیمامی البخاري له معلقات استدلالی پێوه كردیه، لەیەكێک له بابه گرنگەكانی علم.

(١)( العلل المتناهية لإبن الجوزي ج١ لا٧٠ حديث ٨٠)

وە ئیمامی الترمذي وەک پێشەیی هەمیشەی لە سنن دا ڕاستەخۆ تضعیفي نەکردیە، بەڵکو ڕیوایەتی تری هەڵبژارد وەك لەسەرەوە باسمان کرد، وە لە العلل الكبير یش دا هیچ قسەی لەسەر نەکردیە وە لە العلل لابن ابي حاتم دوو پێشەوا گەورەکە هیچ قسەیەکیان لەسەر نەکردووە تەنها ئیمامی الدارقطني نەبێ. جگە لەوە بەشێك لە زاناکانی سەردەم وەك: (سلیمان العلوان والطریفي و العدوي ) ئەوانە کەلەسەر مەنهەجی سەلەفن استدلال بەو فەرموودەیە دەکەن و بە( حسن ) یان داناوە . هەروەها لە ( بابی عەقیدە ) نیە بەڵکو (فضائل ) ـە بۆ ئەوەش زاناکان لەکۆن و نوێ دەستیان سووك کردوەو متساهلتر بوون. کەواتە ئەو فەرموودەیە استدلالی پێدەکرێ وەك بەڵگە دەهێنرێتەوە بۆ پلەو پایەیی زانایان والله أعلى وأعلم.

**شیکردنەوەی ئەم فەرموودە:** لە نێوەڕۆکی ئەم فەرمووده دا چەند پەیامێکی گرنگ و پڕ بایەخی لەخۆ گرتووە وە موژدەیە بۆ ئەهلی علم و فێرخوازی زانستە شەرعیەکان بەو شێوەیە:

١- **ڕێگای زانست ڕێگای بەهەشتە:** مەبەستمان لە زانستەکانی دینە، ئەم مەتنە بەو چەشنە ئیمامی مسلمیش هێناویەتی لێرەدا پلەیی طالب العلم و عالم لەوە دەرەچێت کەوا ئەوان ڕێگای بەهەشتیان بۆ ئاسان دەکرێ تەنها بە هۆی علمەوە، جگە لەوان کێی تر هەوڵی بەدەستهێنانی علم دەدا!؟

٢- **علماء یان زانا:** یەکێکن لە و چینانەی کەوا بەهۆی هەوڵی فێربوونیان بۆ علم و فێرکردنی خەڵك لەزەوی و ئاسمانەکان و تەنانەت نێو دەریاکانیش دووعای لێخۆشبوونیان بۆ دەکرێ، ئەوەشیان بەهۆی فەزلی علمەکەیان ( علم واتە عمل ).

٣- **یەکێ لەو تایبەتمەندیانەی کەوا دراوە بەکەسی (زانا):** پلەیەکی بەرزی هەیە وە وەکو مانگ شبهێندراوە بەسەر تەواوی ئەستێرەکانی ترەوە، بۆچی؟ چونکە مانگ سوودێکی زۆری بۆ تەواوی مرۆڤەکان لەزەویدو هەیە ئەمەش واتایی ئەوەیە کەسی زانا بەهۆی ڕووناکی علمەکەی ڕووناکی بۆ تەواوی دەوروو بەری دەرەخسێنێت، تاوەکو بتوانن لە تاریکی جهل ڕزگاریان بێ.

٤- **زاناکان میراتگری علمی پێغەمبەرانن:** لە ڕوونکردنەوەی ناوەڕۆکی فەرموودەکە دا دەبینرێت کە دەفەمووێ: پێغەمبەران هیچ میراتێکیان نیە دوای خۆیان تەنها زانست نەبێت، ئەمەش واتا هەر زانایەکی متقی و هەڵگری حەقیقی علمەکەی میراتگری پێغەمبەرانن، واتە علمی ئەوان دەبینین سەدان زانای سەلەف و خەلەف مردوون و نەمان بینیون، بەڵام بەهۆی علمەکەیان دەیانناسین، وە هەندێکیان بەهۆی گەورەیی و ئیمامەتی و فەزڵی زانستەکەی بەسەر ئوممەت واهەست دەکەی لەخۆت نزیکن و بینیوتن، چەندان جار ڕەحمەتیان بۆ دەنێریت و داوای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەی، سبحان الله ئەمەش یەکدەگرێتەوە لەگەڵ ناوەڕۆکی فەرموودەکە بەهۆی ئەهلی ئاسمان و زەوی دووعای لێخۆشبوونیان بۆ دەکەن. لەسەرووی هەموویانەوە پێویستە فێرخواز و زانا ئامانجیان لەبەدەستهێنانی علم تەنها لله بێت نەک بۆ خۆ دەرخستن و ناوبانگ و ڕیاو خۆ پێ دەوڵەمەند کردن بێت، چونکە ئەوکات لێ

دەبێتە تۆزی بابردوو پەنا بە الله. کەواتە کەسانێک ئەو ڕێز و پلە و تایبەتمەندییانەیان پێ درابێت وە بەسەر ئوممەت دا فەزڵیان پێ درابێت ڕەدکردنەوەیان و قسە پێگووتیان وە لەهەمووی مەترسیدارتر بە ( بت و داهێنەرو مشرع ) وەسف بکرێن، جگە لە دژە دین و دژە علم کێی تروایان پێدەڵێت ! أفلا تعقلون...؟

## پێگەو گەورەیی کەسی زانا:

أبي الصلت السراج دەڵێت: گوێم لە الحسن البصري بوو دەیگووت: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی: نموونەی کەسی زانا لەسەر زەویدا وەك ئەستێرە وایە کاتێ خەڵك ببینن شوێنی دەکەون، وەکاتێک لێیان وون دەبێ بەدوای دەگەڕێن.[1]

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە ضعيفة، چونکە الحسن البصري تابعیە، وە مرسلاتی ( الحسن ) لای پێشەوایانی سەلەف لە( الجرح والتعديل )دا غير مقبولة.

## پێگەو گەورەیی زانایان لای هاوەڵان:

### ١- عبدالله بن عباس رضي الله عنهما:

ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرمووێت: فێرکەری چاکەو خێر هەموو شتێک دووعای لێخۆشبوونی بۆ دەکات ، تەنانەت نەهەنگ لە نێو دەریاشدا.[2]

---

(١) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٩٢ والفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي )

(٢) ( الدارمي ٣٥٥ ، المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٣٩٠ ، ٣٩١و أخلاق العلماء للآجري لا ٣٦ وابن عبدالبر في جامع بيان العلم ٣٨/١ وابن أبي شيبة ٧٢٨/٨ و العلم لزهير بن حرب )

**دەڵێم (الكردي):** مەبەستی کەسی زانایە وەک فەرموودەی أبو الدرداء کە ڕوونمان کردۆتەوە، بەهەمان شێوە ئەوەش دەچێتە چوار چێوە ئەو پلەو تایبەتمەندییەی کەوا دراوە بە زاناو بانگخواز بەهۆی زانستەکەی.

آدم بن أبي إياس هێناویەتی لە( عمار بن أبي عمار) دەڵێت: ئێمە لای( عبدالله بن عباس) لە ژێر سێبەرێکی بچووك دانیشتبووین لە کاتێ کە ( زيد بن ثابت ) رضي الله عنه وەفاتی کردبوو، ئا بەو شێوەیە زانست و زانیاری دەڕوات ( نامێنێت ) ئەمڕۆ زانستێکی زۆر لەگۆڕ نرا ( نێژرا ).[1]

**٢- عمر بن الخطاب رضي الله عنه:** عمر بن الخطاب رضي الله عنه گووتی: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: فتنه سەر هەڵدەدات وە ( الهرج ) زۆر دەبێت. گووتیان: مەبەست چیە لا الهرج؟ فەرمووی ( کووشتن)، وە فەرمووی : زانست هەڵدەگیرێتەوە و نامێنێت. وە گوێم لە عمری کوڕی خەتاب بوو دەیفەرموو : نەمانی علم مانای وا نیە هەڵدەگیرێتەوە لەنێو سینگی پیاوان ،بەڵکو مەبەست پێی نەمانی زاناکانە.[2]

---

(١) ( العلم والحلم ١٠٧ وە والبخاري لە التأريخ الكبير ٣٨٠/٣ وە ابن سعد لە الطبقات ٣٦١/٢ الحاكم لە المستدرك ٤٢٧/٣ وە البيهقي لە المدخل إلى سنن الكبرى ٩٥ وە المعجم الكبير للطبراني ١٠٨/٥).

(٢) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي٨٤٩ )

## ٣- أَبِي الدَّرْدَاء رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ:

أَبِي الدَّرْدَاء رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: چیە ئەتان بینم زاناکانتان ئەڕۆن وە منداڵەکانتان (نەزانەکانتان ) خۆیان فێر ناکەن، خۆتان فێربکەن پێش ئەوەی علم بڕوات و نەمێنێت، چونکە نەمانی علم واتایی ڕۆیشتنی زاناکانە.[(١)]

أبي إدريس الخولاني دەڵێت: گوێم لە أبو الدرداء رضي الله عنه بوو دەیفەرموو: ئێمە چیبووین گەر بێت قسەی فەقیهەکانمان نەبووایە؛ واتە زاناکانمان.[(٢)]

## ٤- عبدالله بن عباس رضي الله عنهما:

ابْنِ عَبَّاس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرمویت: ئایا دەزانن ڕۆیشتنی علم واتایی چی یان نەمانی چۆنە؟ گووتمان نەخێر ، فەرمووی: نەمان و ڕۆیشتنی زاناکانە.[(٣)]

---

(١) (الدارمي لە سنن، پێشەکی ٢٥١).

(٢) ( الفقيه والمتفقه للخطيب ١٤١ ).

(٣) ( الدارمي لە سنن ٢٤٩ )

### ٥- سلمان الفارسي رضي الله عنه:

آدم بن إياس هێناویەتی لە ( عبدالله بن دينار الشامي ) دەڵێ: (سلمان الفارسي ) رضي الله عنه نامەی نووسی بۆ(أبو الدرداء) پێی فەرموو: چاك بزانە نمونەی کەسێکی زانا لەنێو خەڵکدا وەك پیاوێک وایە کەوا چرایەکی لەشەوی تاریکدا هەڵگرتووە، هەریەك بەلایدا تێپەڕێ ڕووناکی بەردەکەوێ بەهۆی چراکەوە، ئەوانیش دوعای خێر و بەرەکەتی بۆ دەکەن بێ ئەوەی هیچ شتێک لە ڕووناکی چراکەی کەم بکاتەوە.[١]

## پێگەو گەورەیی زانایان لای التابعين :

### ١- الحسن البصري:

پێشەوا الحسن البصري دەڵێت : أبو مسلم الخولاني دەیگووت: نمونەی کەسانی زانا لەزەویدا وەک نمونەی ئەستێرە وایە لەئاسماندا، کاتێک دەیبینن یان لەکاتی بینین شوێنی دەکەون، وەکاتێك لێیان وون دەبێت بەدوای دەگەڕێن دەتوانین بڵێین وون دەبن.[٢]

---

(١) ( العلم والحلم ١١٩ وە شعب الإمان للبيهقي ٢٧٨/٢ وە تأريخ ديمشق لابن عساكر ٤٤٢/٢١ )

(٢) ( المدخل ٣٩٣ و فرض طلب العلم للآجري ٢٩ لا لەڕێگای هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك وە الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي).

چونکە ئەستێرە خوای تعالی بۆ ئەوەی مسخر کردووە تاوەکو خەڵکی ڕێگای پێ بدۆزنەوە . وەدەفەرمویێت : [وَهُوَ ٱلَّذِى جَعَلَ لَكُمُ ٱلنُّجُومَ لِتَهۡتَدُواْ بِهَا فِى ظُلُمَٰتِ ٱلۡبَرِّ وَٱلۡبَحۡرِۗ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡءَايَٰتِ لِقَوۡمٍ يَعۡلَمُونَ ] واتە: وەک چۆن ئەستێرەی ئاسمان ڕووناکیە بۆ خەڵك تاوەکو بتوانن خۆیان وون نەکەن و ڕێگا بدۆزنەوە بەهەمان شێوە، زاناکان لەزەویدا بۆ خەڵک وەک چرا وان تاوەکو بتوانن ڕێگای هیدایەت وون نەکەن و بیدۆزنەوە.

## ٢- سعید بن جبیر:

هلال بن خباب دەڵێت: بە سعید بن جبیرم گووت: چ شتێک نیشانەی لەنێو چوونی خەڵکە؟ فەرمووی: کاتێ زاناکانیان نەمان.

# پێگەو گەورەیی زانایان لای أتباع التابعين و سەلەفدا:

## ١- مالك بن أنس:

ئیمامی مالك دەڵێت: پێمان گەیشتووە کەوا عیسی ابن مریم فەرموویەتی: خەڵکانێک دێن کەوا فقهاء علماء وەک بڵێی تێگەیشتنی پێغەمبەرانیان هەبێت. ( الفقه والمتفقه ١٤٠).

---

(١) ( العلم والحلم لآدم بن أبي إياس ١٠٦ وە الدارمي ٢٤٧ وە ابن ابي شيبة لە مصنف ٤٥٧/٧ وە الحلية لأبي نعيم ٢٧٦/٤ )

(٢) ( الفقه والمتفقه ١٤٠).

**دەڵێم:** ئەو ڕیواتانە پێیان دەڵێن: البلاغات، بۆ نمونە یەکێک لە پێشەوایانی فەرموودە دەڵێت: پێمان گەیشتووە لە فلان کەس، وە جگە لەوەش مرفوع نیە بۆ پێغەمبەر وە لەبابی ئیسرائیلیاتیشە بۆیە تەنها بۆ بینین دەخرێنە ڕوو، بەڵام وەك لە پێشدا کۆمەڵێك فەرموودەو آثر مان داناوە لە پلەو پایەی زانایان.

## ٢- سفيان بن عيينة:

پێشەوا سفيان بن عيينة دەڵێت: بەرزترین ی خەڵكان لای الله تعالى ئەوانەن کەوا لەنێوان الله و بەندەکانیدان،ئەوانیش: ( پێغەمبەران و زانایانن ).[١]

## ٣- أبي بكر بن عياش:

(أبي بكر بن عياش) دەڵێت: وانازانم لەدونیا کۆمەڵێک هەبێت چاکتر بێت لەوان. واتە أهل الحديث.[٢] أبي بكر بن عياش ناوی أبو بكر بن عياش بن سالم ه و ناوبانگی بە أبو بكر بن عياش الأسدي ـه ، وە کونیەکە بریتییە لە أبو بكر. ساڵی ٩٥ ﻫ لەدایك بووە، لە ساڵی ١٩٣ ﻫ وەفاتی کردووە واتە لە أتباعى تابعين بوو لە چینی خير القرون.

---

(١) ( الفقه والتفقه للخطيب ١٣٤،١٣٥)

**(٢)** ( شرف أصحاب الحديث للخطيب ٨٨ و سنده صحيح ).

عمر بن حفص دەڵێ: گوێم لە باوکم بوو پێی گووترا: ئەی باوکی عمر ، ئایا نابینی هاوەڵانی حدیث چۆن گۆڕاون و چۆن خەراپ بوون؟ گووتی: ئەوان لەسەر ئەوەن کە بژاردەی خێڵەکانن، واتە چاکترینی کۆمەڵگان.[١]

## ٤- احمد بن حنبل:

أبو بكر المروزي دەڵێت: باوکی عبدالله واتە احمد بن حنبل گووتی: هیچ چینێک لای من باشتر و چاکتر نیە لە ئەهلی حدیث، تەنها فەرموودە دەناسن و دەزانن. وەدەڵێت: ئەهلی حەدیث لەپێشترن کەوا قسە لە علم (دین) بکەن.[٢]

## ٥- أبو يوسف القاضي:

إبراهيم الحربي دەیگووت: (أبو يوسف القاضي)[٣] دەرچووە دەر ڕۆژێکیان، وە هاوەڵانی فەرموودە (طالب الحديث ) لەسەر دەرگابوون ، گووتی : لەزەیدا چاکتر نیە لە ئێوە، ئەوەنیە دێن و گوێ لە فەرموودەی رسول الله صلى الله عليه وسلم دەگرن.[٤]

---

(١) (شرف أصحاب الحديث للخطيب ٨٩ ) (٢)( شرف أصحاب الحديث ٩٠ صحيح )

(٣) أبو يوسف القاضي ناوی يعقوب بن إبراهيم بن حبيب بن خنيس بن سعد بن حتبة‌ية، ناسراوە بە أبو يوسف القاضي، وە کونیەیەکەی بریتییە لە: أبو يوسف. خەڵکی بەغداد بووە وە لە بەغدا و کوفە ژیاوە و لە بەغداش مردووە . لە ساڵی ١١٣ هـ لەدایک بووەو لە ساڵی ١٨٢ هـ وەفاتی کردووە. واتە لە چینی ئەتابعی تابعينە.

(٤) ( شرف أصحاب الحديث للخطيب ٩٤ صحيح )

### ٦- علي بن عبدالله:

خطيب هێناویەتی له إبراهيم بن مغفل دەیگووت: گوێم له باوكی عبدالله محمد بن إسماعيل البخاري بوو دەیگووت: ئێمه سێ يان چوار كەس دەبووين لەبەر دەرگای ( علي بن عبدالله )[١] بووين، گووتی: من ئومێدم وايه كەوا تآويلي ئەو فەرمووده: (لا تزال طائفة من أمتي ظاهرين على الحق، لا يضرهم من خذلهم أو خالفهم) هيوام وايه ئێوه بن، چونكه بازرگانەكان خۆيان به بازرگانيەوه خەريک كردووه ،وه پيشەوەرانيش به پيشەی خۆيانەوه خەريكن، وه دەسەڵاتدار مەشغوڵی خەڵكەكەن، بەڵام ئێوه سونەتی رسول الله صلى الله عليه وسلم زيندوو دەكەنەوه.[٢]

### ٧- هارون الرشيد:

محمد بن العباس المصري دەیگووت : گوێم له (هارون الرشيد)بوو دەیگووت: "وطلبت الحق فوجدته مع أصحاب الحديث." واته: وه بەدوای حەقدا گەڕام لەلای هاوەڵانی فەرموودەم دۆزيەوه.[٣]

---

(١) علي بن عبدالله ( ابن المديني )، ناوی علي بن عبد الله بن جعفر بن نجيح ـه ناسراوه به علي بن المديني، وه كونيەكەی بريتييه له: أبو الحسن. لەساڵی ١٦١ هـ لەدايك بووه و لەساڵی ٢٣٤ هـ وەفاتی كردووه. لەشاری مەدينه و بەسرە دا ژياوه و له شاری( سر ) رای مردووه. شێخی هاوەڵانی كتب الستەيه بەتايبەت ئيمامی البخاري، وه هاوشان و هاو تەمەنی ئەحمد و ابن معين و ابن راهوية بووه وەك دەڵێن: ( عالم العلم العلل ) ئيمام و ثقة و ثبت و حجة بووه، له محنەی خەلقی قورئان لەژێر ئيكراهدا وەڵامی داواكەی داوه، بەڵام دواتر تەوبەی لێكرد.

(٢)( شرف أصحاب الحديث للخطيب البغدادي ، ١٠٢ في سنده مقال )

(٣) ( شرف أصحاب الحديث ١٠٤ )

## ٨- الوليد الكرابيسي:

أحمد بن سنان دەیگووت: الوليد الكرابيسي خاڵم کاتێک کەوتە سەرە مەرگ بە کوڕەکانی گووت: ئایا دەزانن کەسێک هەبێت شارەزاتر بێ لەمن بە ( الكلام ، واتە وەك دەڵێن علم الكلام)؟ گووتیان: نەخێر. گووتی : ئایا تاوانبارم دەکەن؟ گووتیان نەخێر ، پێی گووتن من وەسیەتێکتان دەکەم ئایا لێم قبوڵ دەکەن؟ گووتیان بەڵێ، لەسەر ئەوە بڕۆن کەوا هاوەڵانی فەرموودە لەسەرین ( أصحاب الحديث ) چونکە من بینیم حەق لای ئەوانە.

**دەڵێم:** الوليد الكرابيسى: یەکێک بووە لەسەرانی معتزلە و عاقڵانی لەسەردەمی بشر المريسى ژیاوە، بەڵام وەك دەبینرێ لەسەرەمەرگدا تۆبەی لێدەکات وەك الذهبي لە تأريخ الإسلام و سير أعلام النبلاء یش ئەو بەسەرهاتە نەقڵ دەکات.

## ٩- سهل بن عبدالله التستري:

سهل بن عبدالله التستري دەڵێت: هەریەك دەیەوێت سەیری مجلیسی پێغەمبەران بکات، ئەوا باسەیری مجلیسی زانایان بکات.[١]

سهل بن عبدالله التستري دەڵێت: هەریەک دەیەوێ سەیری مەجلیسی پێغەمبەران بکات،

(١) (الفقيه والمتفه للخطيب ١٣٦).

ئەوا باسەیری مەجلیسی زاناكان بكات، یەكێ دێ دەڵێ: ئەی فلان چیدەڵێی بەپیاوێك سوێندی خواردووە لەژنەكەی واو وا بكات؟ دەڵێ تەلاقی كەوتووە، یەكێ تر دێ و دەڵێ : پیاوێک سوێندی لەسەر ژنەكەی خواردووە و بەووەو بەوە؟ دەڵێ: هیچ شتێكی لەسەر نیە بەو قسە، ئینجا ( سهل) دەڵێت: ئەو شتە یا تایبەتمەندییە بۆكەس نیە ئیللا پێغەمبەر یان زانا نەبێت، ئەوە بزانن.[1]

**دەڵێم (الكردي):** ( ئەو آثرانەی هاوەڵان و تابعین و دوای ئەوان هەموویان ئەوە دەسەلمێنن كەوا علماء واتە علم، ( علم یش واتە دین ) وەك لە پێشتردا باسمان كرد لە فەرموودەی صحیح ی هاتوو لە رسول الله كەوا بەهەمان شێوە وەسفی زاناكانی كردووە بە علم، نەمانی زاناكان لەنێو خەڵكدا واتای نەمانی علمە، لەهەر شوێێكیش علم نەمێنیت ئەوا جهل تێیدا بڵاو دەبێتەوە. (بەبەڵگەی فەرموودەی صحیح كە هاتووە لە كتب الستة والتسعة لە رەسولی ئەكرەم صلى الله عليه وسلم كەدەفەرمووێت: علم نامێنێت، جهل بڵاو دەبێتەوە) كە ئەم فەرموودەیە یەكێكە لە و فەرموودانەی زانایان لە كتێبەكانی (أشراط الساعة و الفتن ) هێناویانە، وە جگە لەوەش یەكێكە لەو نیشانە بچووكانەی كە ئەمڕۆ وە لەو سەدە و سەردەمەی كە ئێمە تێیداین دەركەتوە بەداخەوە، بۆیە دەبینین خەڵک بەهۆی نەمانی زاناكان واتە چراكان چونكە لە تاریكی جهلدا دەخنكێن و ناتوانن خۆیان دەربازكەن، بۆیە كەسانی جاهل بەهۆی جەهلەكەیان ڕقیان لەعلم و هەڵگرانی علم دەبێتەوە، وەك سالب و

(١) (الفقيه والمتفقه للخطيب البغدادي لا ١٤٩ ژ ١٣٦ )

موجب وایە دژی یەکن.،( علم جهل ناهێڵێت،جهلیش ڕێگری لەعلم دەکات ) واتە: جەنگی حەق و باطل. ( الفرقان ) لێکجیاکردنەوەی حەق و باطل وە کوفر و ئیمان، چونکە دین هەمووی علم و حەیاو ئەدەبە، ئامانجی پاککردنەوە و نەهێشتنی جەهلە، بۆچی دەگووترێت ( سەردەمی جاهلیەت )؟ چونکە خەڵك بەهۆی دوورکەوتنەوە لە دینی حەقی ئیبراهیمی نغرۆی جهل بوون وە لەنێو کانیاوی جهل ڕووچووبوون، تاوەکو ڕووناکی ( ئیسلام ) کەهات بە( علم ) لەناوی برد، ئێستا بەهۆی لافاوی جهل ڕووناکی علم نامێنێت وەهەوڵی نەهێشتنی دەدرێ وەك کە نەماوە تەنها کەمێك نەبێت پەنا بە الله).

## کاریگەری یەك زانا بەرامبەر ١٠٠٠ عابدە:

دیراسە و تەحقیقی ئەو فەرموودە مشهورە بە کورتی: (ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرموێت: پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: کەسێکی تێگەیشتوو ( فقیھ یان زانا ) زۆر سەختترە لەسەر شیطان لە ١٠٠٠ عابدی.[(١)]

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە: هەندێک بە موضوعیان داناوە وە هەندێک بەلاواز،

---

(١)( الترمذي ٢٦٨١ وە ابن ماجە ٢٢٢ وە فرض طلب العلم للآجري ٧ وە لە أخلاق العلماء ١٢ وە ابن حبان لە المجروحين ٣٠٠/١ وە البيهقي لە شعب الإمان ١٧١٥ وە الفقيە والمتفقە للخطيب ٨٢،٨٣ وە جامع بيان العلم ١٢٢ وە العلل المتناهية لابن جوزي ١٩٢ )

بەڵام سەرەڕایی لاوازی فەرموودەیەکی مشهورە و لەزۆرینەی کتوبەکانی حدیث و علم هاتووە، گەر لە ڕووی سەنەدەوە لاوازیش بێت ئەوا ماناکەی صحیحة چونکە شیطان هەتا کەسێکی زانای تێگەیشتوو لەدین فریو ئەدات سەدان جاهل و عابد فریو ئەدات، مەبەست لە زانای کارکردوو بە زانستەکەیەتی.

## ئەو زانایەیی کار بە زانستەکەی ناکات:

١- خطیب البغدادي هێناویەتی لە حذیفة بن الیمان، رضي الله عنه: دەڵێت: رسول الله صلی الله علیه وسلم فەرمووی: «ویل لمن لا یعلم، وویل لمن علم ثم لا یعمل ثلاثا». واتە: هاوار بۆ ئەوکەسەی کەوا نازانێت ( علم ) وە هاوار بۆ ئەووەی دەیزانێت و کاری پێ ناکات، سێ جاران.[(١)]

**دەڵێم (الکردي):** لەڕووی سەنەدەوە ضعیفة زۆر.

٢- وە بەڕیوایەتی تر هاتووە لە هاوەڵی بەڕێز أبو الدرداء فەرموویەتی: «ویل للذي لا یعلم، وویل للذي یعلم ولا یعمل، سبع مرات» واتە: هاوار بۆ ئەووەی نایزانێت وە بۆ ئەووەش دەیزانێت بەڵام کاری پێناکات، حەوت جار.[(٢)]

---

(١) ( اقتضاء العلم العمل للخطیب ٦٤،٦٥،٦٦ والآجري في اخلاق العلماء ٥٩ وجامع بیان العلم وفضله ٤/٢ واحمد في الزهد ٦٣/٢ و ابن عساکر في ذم من لایعمل بعلمه ٧ و العلم والحلم لآدم بن أبي إیاس ٤٥ )

(٢) ( اقتضاء العلم العمل للخطیب البغدادي ٦٧ وە الزهد لوکیع ٢١٧ وە الزهد لاحمد ٧٦٣ وە أخلاق العلماء للآجري ٥٦ وە جامع بیان العلم لابن عبدالبر ١٢١٢)

**دەڵێم (الكردي):** لە ڕووی سەنەدەوە موقوفە تا أبي الدرداء ، هەروەها هیچ ڕیوایەتێکی صحيح مان نیە بەو شێوە( مرفوع ) بێت، بەڵام ماناکەی صحيحة، بەوەی نەزانین و جهل بە علم واتە دین ماڵ وێرانیە وە لەو ماڵ وێرانتر ئەوەیە کەوا ئەوەی شارەزا و زانا بێت بەڵام کاری پێنەکات، لەو بارەوە ئایەت و فەرموودەی صحيح مان هەیە لەسەر ئەوانەی کەوا کار بە علمەکەیان ناکەن.

٣- خطيب البغدادي هێناویەتی لە جندب بن عبد الله رضي الله عنه دەڵێ: رسول الله صلى الله عليه وسلم فەرمووی: نمونەی ئەو زانایەی کەوا خەڵکی فێرەکات وە خۆی بیر دەچێتەوە وەکو (چرا یان فتیل ) وایە ڕووناکی بۆ خەڵکیە و خۆی دەسووتێنێت

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە ضعيفة. واتە: ئەو کەسەی کەوا زانایە و شارەزایە بە شەرع و خەڵکی فێری دین دەکاو بانگەواز دەکات بۆی بەڵام خۆی جێبەجێی ناکات و وەك بڵێی خۆی نەگرێتەوە، ئائەو کەسانە تەنها سوودیان بۆ خەڵکە لەو لایەنە بەڵام ناتوانن سوود بەخۆیان بگەیەنن، چونکە کاریان پێنەکردووە.

---

(١) ( اقتضاء العلم العمل للخطيب ٦٩,٧٠ وە الطبراني في الكبير ١٧٨,١٧٩,١٨٠/٢ وە ابن عساكر هێناویەتی لە (ذم من لايعمل بعلمه ٩ )وە المنذري لە الترغيب والترهيب ١٢٦,١٢٧/١ بە [حسن ]ی داناوە )

٤- خطيب البغدادي وه ابن عساكر هێناویانه له جابر بن عبدالله رضي الله عنهما له پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم فەرمووی: کۆمەڵێك له ئەهلی بەهەشت بە کەسانێک له ئەهلی جەهەننەم دەڵێن: بەچ شتێک خراونەتە نێو ئاگرەوە خۆ ئێمە بە هۆی فێرکردنی ئێوەوە خراوینەتە بەهەشتەوە؟ ئەوانیش دەڵێن: ئێمە فەرمانمان بەئێوە دەکرد بەڵام خۆمان جێبەجێمان نەدەکرد.[(١)]

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە ضعيفة والله اعلم بەڵام ماناکەی صحيحة و فەرموودەی تری صحيح کەوا البخاري ومسلم هێناویانه.

٥- ابن عساكر هێناویەتی له هاوەڵی بەڕێز أبو هريرة رضي الله عنه ئەویش له پێغەمبەرەوە صلى الله عليه وسلم دەفەرمووێت: چاکترینی ئوممەتەکەم زاناکانن، وە چاکترینی نێو زاناکان ئەوانەن کەوا بەسوزو بەزەیین، الله عز وجل خۆشدەبێت له ٤٠ گوناهی کەسێکی جاهل پێش ئەوەی خۆشبێ لەیەك گوناهی کەسێکی زانا، .... الخ الحديث ).[(٢)]

---

(١) (اقتضاء العلم العمل للخطيب ٧٢,٧٣ وه ذم من لايعمل بعلمه ابن عساكر ١٣ و العلم والحلم لآدم بن أبي إياس ٤٦ والطبراني في الأوسط ١/٣٧)

(٢) ( ابو نعيم له الحلية ٨/١٨٨ وه خطيب البغدادي له تأريخ ١٠/٢٣٨ وه له موضوع أوهام الجمع والتفريق ٢/ ١١٥ وه الأباطيل والمناكير والصحاح والمشاهير للجورقاني ،كتاب العلم ج ١ لا ٢٢٦ وه ابن عساكر له ذم من لايعمل بعلمه ١١ .)

**دەڵێم(الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە هەموو ڕێگاکانی کە لێوەی هاتوون ضعیفة. الجورقاني لە الأباطیل دەڵێت: حدیث غریب حسن. وە لە ڕووی مەتنەوە: منكر و باطلة وەك الذهبي و ابن حجر وادەڵێن لە متأخرین.

٦- خطیب البغدادي و البیهقي و ابن عساكر هێناویانە لە هاوەڵی بەڕێز أنس بن مالك رضي الله عنه دەڵێت: پێغەمبەر صلى الله علیه وسلم فەرموویەتی: الله عزوجل لە کەسانی جاهل نەزان خۆشدەبێت بەو شێوە لە زانایان خۆشنابێت.[(١)]

**دەڵێم (کاروان کەمال الكردي):** لە ڕووی سەنەدەوە عبدالله بن احمد دەڵێت: باوکم گووتی: ئەو فەرموودە منكرە.[(٢)] والدارقطني لە العلل ٣٤/١٢ دەڵێت: معلول بالإرسال واتە مرسلە. أبو نعیم دەڵێت: حدیث غریب. واتە ضعیف. البیهقي دەڵێت: ئەگەر ئەو خەبەرە ڕاست بێ ئەوا بەو شێوەیەیە کەوا هاتووە، بەڵام گەر وانەبێت ئەوا زانایەکی فاجر و جاهلێکی فاجر لە تاواندان وەك یەكن، تەنها زاناكە بەفەزڵی علمەكەی تایبەت دەكرێ بەڵام ئەو نەزانەی کەوا دەزانێت حەڕامە بەڵام دەیكا وەئەوەی کە نایزانێت پێویستە فێر بکرێ لەو زانستانەی کەوا گشتین ... الخ. ئەوە تەنها ڕای زانایەكە گەرنا کەسێکی جاهل بکەوێتە نێو کوفر و شرك ئەوا عوزری بۆ نیە والله أعلم.

---

(١)( المدخل إلى سنن الكبرى ٥٦٥ وە اقتضاء العلم العمل ٨٠ وە ذم من لایعمل بعلمە ١٠ وە المحدث الفاضل للرامهرمزي ٦٠٥ والمروزي في الورع ٢٣ وە العلل المتناهیة لابن جوزي ١٤٠/١ ژمارە ٢٠٤ و العلم والحلم لآدم بن أبي إیاس العسقلاني ٣٧)

(٢) (المدخل للبیهقي ٥٦٥).

٧- آدم بن أبي إياس هێناویەتی لە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: پیاوێک پرسیاری لە رسول الله کرد و پێی گووت: چ شتێک شەڕە واتە فتنەیە؟ پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمووی: ئەی خەڵکینە پرسیاری خەراپەم لێ مەکەن، بەڵکو پرسیاری چاکەم لێبکەن، بەڵێ شەڕ زانا خەراپەکانن وە خێریش زانا چاکەکانن.[1]

**دەڵێم (الكردي):** لەڕووی سەنەدەوە ضعيفة والله تعالى أعلم.

البيهقي هێناویەتی لە فضيل بن عياض دەڵێت: الله تعالى لە حەفتا گوناهی کەسێکی جاهل خۆشدەبێ پێش ئەوەی لەیەك گوناهی زانایەك خۆشبێت.[2]

**دەڵێم:** ئەو فەرموودە و آثرانە گەرچی (مرفوع ) نەبن، بەڵام ماناکەیان تەواو چونکە چۆن کەسێکی زانا وەک لەپێشدا باسمان کرد پلەو پایەکی بەرزو بڵندی هەیە بەهەمان شێوە لەڕووی سزاوە زیاترە وەک لە کەسێکی نەزان، بەهۆی ئەوەی زاناکە زانابووە پێی بەڵام هەر کردوویەتی، بەڵام هەمووجاهلێک نا چونکە جهل بە توحيد مقبول نیە وە هیچ عوزرێکی نیە لەبەر ئەوەی هەریەك لە (ئیمام الآجري لە فرض طلب العلم وە ابن عبد البر لە جامع بيان

---

(١) ( العلم والحلم لآدم بن أبي إياس ٤١ وە الدارمي في السنن ٣٨٢ والبزار في المسند ٩٣/٧ والحلية لأبي نعيم و ابن عدي في الكامل )

(٢) ( المدخل إلى سنن الكبرى للبيهقي ٥٦٣ )

العلم ئیجماعی زانایان باسدەکەن لە سەر ئەوەی هەندێ علم ( فرض العینة ) لەوانیش ئیمام و شەهادەو حەلاڵ و حەرام و ناسینی الله عزوجل بە ئەسمائو سیفاتەوە). کەواتە ئەگەر شتێک فەرزی تایبەت بێت لەسەر هەموو تاکێک ئەوا بەدڵنیاییەوە نەزانین و بێ ئاگایی عوزر تێیدا قبوڵ نیە. بۆیە سەلەف زۆر ترساون لەو بارەوە هاتووە لێیانەوە بەو شێوە:

ئیمامی تابعي الشعبي دەیگووت: خۆزگە لەو زانستەی کەوا دەیزانم هیچم نەزانیبایە. وە لە پێشەوا سفیان الثوري هاتووە بەهەمان شێوە.[١]

سفیان بن عیینة: دەیفەرموو: علم ئەگەر سوودت پێ نەگەیەنێت ئەوا زیانی هەیە.[٢]

پێشەوا ئیبراهیمی کوڕی ئەدهەم گووتی: پیاوێک دەرچوو بەمەبەستی فێربوونی علم، لەرێگادا گەیشت بە تاشە بەردێک لەسەری نووسرابوو هەڵمگێڕە شتێکی سەیر دەبینیت، ئەویش هەڵیگێڕاو بینی نووسرابوو لەسەری: تۆ بەوەی کەدەیزانیت کاری پێناکەیت، چۆن داوا دەکەیت کەکاری پێناکەیت، ئینجا پیاوەکە گەڕاوە.

---

(١) ( اقتضاء العلم العمل للخطیب ٨٢،٨٣ ).

(٢) (اقتضاء العلم العمل للخطیب ٨٤).

(٣) ( اقتضاء العلم العمل للخطیب ٩١ ).

واتە مەرجی سەرەکی فێربوونی زانست واتە دین کارپێکردنیەتی وەك دەڵێن: ( العلم موقوف على العمل )، بۆیە پێشەوا فضيل بن عياض دەیفەرموو: ئەو حەدیسە پیاو گوێی لێنەبێت چاکترە بۆی لەوەی گوێی لێ بێت و کاری پێنەکات.[1]

## رق و بوغز بەرامبەر بە زانایانی سەرڕاست نیشانەی گومڕاییە:

١- خطيب البغدادي هێناویەتی لە قتيبة بن سعيد دەیگووت: ئەگەر پیاوێکت بینی کەوا ئەهلی حەدیسی خۆشدەویست، هاوشێوەی : يحيى بن سعيد القطان، وعبد الرحمن بن مهدي، وأحمد بن حنبل و إسحاق بن راهويه، ئەوە بزانە لەسەر سوننەتە، وە ئەوەی پێچەوانەی ئەوە بێت ئەوا مبتدع ە.[2]

٢- خطيب هێناویەتی لە أحمد بن سنان القطان دەیگووت: هیچ بیدەع کارێک نیە لەدونیا دا ئیللا رِقی لە ئەهلی حەدیس دەبێتەوە، چونکە ئەگەر پیاو بیدعە بکات ئەوا خۆشی حەدیس لە دڵی دادەبەزێت.[3]

(١) ( اقتضاء العلم العمل للخطيب ٩٣ )

(٢) [[شرف أصحاب الحديث للخطيب].

(٣) [شرف أصحاب الحديث للخطيب].

٣- خطیب هێناویەتی لە محمد بن عبد الله الحافظ دەڵێ: گوێم لە أبا الحسین محمد بن أحمد الحنظلي بوو دەیگووت: گوێم لە أبا إسماعیل محمد بن إسماعیل الترمذي بوو گووتی: من و أحمد بن الحسن الترمذي لای باوکی عبدالله أحمد بن حنبل بووین، أحمد بن الحسنپێ گووت: ئەی باوکی عبدالله لەلای( ابن أبي قتیلة ) لەمەککەدا باسی ئەهلی حەدیس کرا، ئەویش گووتی: ئەهلی حەدیس کەسانی خەراپن. دەڵێ: ابو عبدالله احمد بن حنبل هەستاو گووتی: «زندیق، زندیق، زندیق،ئینجا هەستاو جلەکانی داتەکاند و ڕۆیشتە ماڵەکەی خۆی.[١]

**دەڵێم:** لێرەوە دەردەکەوێ سەلەف پێوەری ناسینی ئەهلی حەق و باطل یان بەوە کردووە کەوا خۆشویستنی زانایان و ڕق لێبوونەوەیان، واتە هەر یەک بێت ڕق و بوغزی بەرامبەر ئەهلی سوننە هەبێ ئەوا لەنیشانەی گومڕاییە یان زانایان ڕەفز بکات.

(١) [شرف أصحاب الحدیث للخطیب]

## بەشی سێیەم: ڕێگاکانی فێربوونی زانستی شەرعی:

بەهۆی ئەوەی ژمارەیەک خووشک و برای موسڵمان داوایان کرد کەوا خشتەیەك یاخوود جەدوەلێکیان بۆ دابنێم کە ببێتە هۆی یارمەتیدەریان بۆ فێربوونی زانستی شەرعي وە لەسەرەتای قۆناغ چیبکەن و چۆن دەست پێبکەن، بێگوومان [پرسیار کردن چارەسەری نەزانیە] وەك ئیمامی ئەبو دواد لە سنن بە سەنەدی صحیح هێناویەتی: [إنما شفاء العي السؤال] ئەمەش دوای ئەوە هات یەکێک لەهاوەڵان بریندار بوو برینەکەی قووڵ بوو لەیەکێک لە غزاو سەفەرەکاندا، وە لەشەوێکی زستانی زۆر سارد دا تووشی جەنابەت بوو بۆیە ئەویش پرسیاری کرد ئایە من دەتوانم تەیەموم بکەم؟ ئەوانیش گووتیان: نەخێر، دەبێت بەهەر جۆرێک بێت خۆت بشۆیت، ئەویش ناچار خۆی دەشوات دواتر بەهۆی ساردی و برینداری وەفات دەکات. دوای ئەوە هەواڵ دەدرێ بە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم ئەویش دەفەرموێت: کوشتیان بەکووشت بچن ئەی نازانن چارەسەری نەزانی پرسیار کردنە.

کەواتە تۆ لەهەر قۆناغ و لەهەر تەمەن و هەر کەسێکی ئەگەر نەتزانی ئەوا دەبێت بپرسیت، باشە لەکوێ دەپرسن چۆن دەپرسن؟ خوای تعالى لەقورئان دەفەرموێت: [فسألوا أهل الذكر ان كنتم لاتعلمون]، گوومان لەوە نیە ئەهلی الذكر: واتە زاناکان ئەوانەن کەوا تێدەگەن وە تێدەفکرن. الذهبي لە سير أعلام النبلاء هێناویەتی وە آبن الجوزي لە مناقب أحمد، ئیمامی ئەحمد دەچێتە یەمەن وە شاری صنعاء لەپێناو فێر بوونی علم بۆ ئەوەی حدیث وەربگرێت لە [عبدالرزاق الصنعاني] یەکێک لە زانا گەورەکانی سەلەف وە خاوەنی (مصنف عبدالرزاق ) ە، کاتێک دەچێت لەدەرگای ماڵیان دەدا لەوکاتە یەکێک لەوان دەڵێت: بەئیمام ئەحمد

لەسەر خۆ چونکە شێخ ئیزعاج دەبێت یان نارەحەت دەبێت، ئیمامی ئەحمد لەبەر دەرگا دادەنیشێت هەتا کاتی مەغریب، ئینجا عبدالرزاق دێتە دەرەوە کتێبێکی حدیثي پێیە ئیمامی ئەحمد دەڵێت: ڕەحمەتی خوات لێبێت لەو حدیثانەی کە پێتە بۆم باس بکە یان بیگێڕەوە، دواتر عبدالرزاق کە دەزانێت احمدە دەڵێت: ئەوە تۆ باوکی عبدالله بۆیە باوەشی پێدەکاو خزمەتی دەکات. بەڵێ بەم جۆرە زاناکان لەسەر چۆک لەخزمەت زاناکان فێری علم بوون، ئیمامی یحیي بن سعید القطان کە شێخی ئیمامی ئەحمد و علی ابن المديني و یحیي بن معین و عمرو بن علی الفلاسە دەڵێت: من بەرەبەیان لەماڵ دەردەچووم هەتا کاتی عیشا نەدەگەڕامەوە بۆ طلبي حدیث.[١]

ئەگەر بگەڕێینەوە بۆ ژیاننامەی ئیمامەکان ئەوا دەبینین دەیان ساڵ بۆ فێر بوون گەڕاون و هەوڵیانداوە بۆ ئەوەی شارەزا بن لەدین، خۆ ئەگەر نەگەڕابان و هیچ هەوڵ و جهدێکیان نەکردبایە ئەوا هەر بەنەزانی دەمانەوە و لە کانیاوی جهل دەخولانەوە، لێرەدا ناچمە نێو ووردەکاری زیاتری طلبي حدیث و باسکردنی زانایان چونکە لەزۆر شوێن ونامیلکەی تر ڕوونمان کردووەتەوە و ڕوونی دەکەینەوە إن شاء الله، ئەوەی هەیە ئێمە و ئەوان جیاوازین جیاوازیشمان لە زۆرینەی لایەنەکاندایە یەکێک لەوانە ئەوان هەر لەمنداڵیەوە دەخرانە بەر خوێندنی قورئان و تجوید و تفسیر و سیرەی نبوی بەڵام ئێمە هەتا تێپەڕینی زیاتر لە بیست ساڵ خەریکی خوێندنی دونیایی و سین و صاد بووین، چەندان ساڵ قەواعیدی عەرەبی و اعرابمان خوێند لەکۆتایی دا یەک ڕستەش ناتوانین اعراب بکەین، بۆیە پێویستە جەدوەلێکی

(١)[ خطیب هێناویەتی ]

خێراو بەپێی تەمەن و کات دابنرێ چونکە ئەگەر ئێمە وەک ئەوان بەو پلە تدریجیە دەست پێ بکەین بیست ساڵی دەوێت. وەک معلومە ئێمە بۆ ئەوەی ببینە مامۆستای زمانی کوردی کە بەحساب زمانی دایکە ئینجا پێویستە بێ هیچ کەوتنێک شانزە ساڵ بخوێنین، فکیف بۆ زانستی شەرعی کەوا زانستی دونیاو ئاخیرەتە! ئەوەی کەمن باسی دەکەم وە دای دەنێم ئایەت و حدیث نیە، بەڵکو ڕێگای تێگەیشتن و فێربوونی ئایەت و حدیثة بۆ هەردوولا، هەم ئەوانەی عەرەبی دەزانن وە ئەوانەی نایزانن تەنیا جیاوازیەک ئەوەیە ئەوانەی عەرەبی نازانن ناتوانن زیاتر لە هەندێ قۆناغ تێپەڕێنن وەک لەوانەی عەرەبیان باشە و تێ دەگەن، بۆیە هەر لەسەرەتاوە دەست پێدەکەین واتە کەسێک هیچ شتێکی شەرعی نەزانێت بیەوێت فێر بێت یەکەم هەنگاو چیبکاو چۆن هەنگاو بهاوێت، لەهەموو هەنگاو قۆناغەکان ناوی کتێب و نوسەرەکەی ئاماژە پێدەدەین وە جگە لەوەش من باشترین و هەڵبژێردراوترین و گونجاو ترین کتێبەکان دادەنێم وەباسدەکەم، وە خوودی خۆم لەزۆرینەی کتێبەکان کەدەمخوێند لەسەر علومەکان نوسەرەکانم دەکردنە مامۆستا یاخود محققەکان، بۆنمونە لە تحقیقاتی هەر کتێب و نامیلکەیەکدا کەسی محقق باسی سەرجەم ئەو شیکردنەوە و شرۆڤەکردنانە دەکات کەلەسەر ئەوکتێبە هاتووە وە باشترینەکانیشان دیاری دەکات، بۆ نموونە:

لە تحقیقی کتێبی الناسخ والمنسوخی قورئان کە أبي جعفر النحاس نوسیویەتی ئاماژە بەوە دەکات باشترین کتێبە تایبەت بێت بە و علمە وە گشتگیر ترینیانە، من لەسەرەتادا الناسخ والمنسوخي [قتادة بن دعامە] م خوێند دواتر [آبن شهاب الزهري] دواتر بەدواداچوونم کرد لەڕێگەی ئەلکترۆنی وە پرسیار لەکەسانی بەئەزموون کەوا متفق بوون لەسەر ئەوەی کتێبەکەی [أبو جعفر النحاس] لەو بوارە بێوینەیە وەلەدوای ئەو کتابەکەی [ابن جوزي]

هاوشانە لەگەڵ ئەودا لەو علمە، کەواتە بەپرسیار کردن و خوێندنەوە گەیشتوومە ئەو ئەنجامە لەسەر کتێبەکان، زانستەکانی شەرع دابەشی سێ بەشی سەرەکی دەکەم:

١- علم القرآن.

٢- علم الحديث.

٣- علم العقيدة.

پێش چوونە سەر ووردەکاری پێویستە ئەوە بزانن کەوا عقیدە لەسەرووی هەموو شتێکەوەیە، بۆ؟ چونکە ئەگەر عەقیدەت تەواو نەبوو لارو پێچی تێدا بوو ئەوا ئەگەر هەموو علومەکانی نێو قورئان و حدیث سوودی بۆت نابێت.

**بەڵگەش ئەوەیە:** لەسەرەتادا رسول الله صلى الله عليه وسلم ماوەی سێزدە ساڵ خەڵکی فێری عقیدە ئەکرد، وە تەنها بانگی دەکردن بۆ ئەوەی عقیدەیان چاك بکەن، بۆچی؟ چونکە ئەوان عقیدەیان تەواو نەبوو مشرک بوون وەلەهەمان کاتدا خۆیان پێ مسلم بووا! ڕاستە قورئان گەورەترین علمە وە حدیث دوای ئەو بەڵام پێویستە عقیدەکەمان لەسەر قورئان بنیاد بنێین، ئەوکات ئەو علمەی کە فێری دەبین سوودی دونیاو قیامەتی بۆمان دەبێت. لەسەرەتادا باسی عقیدەکە دەکەین چونکە علوم القرآن هەتا کۆتایی تەمەنت لەگەڵ علوم الحديث تەواو نابێت.

## یەکەم: علم العقیدة: زانستی بیروباوەڕ

کە دەڵێین علوم العقیدة واتە: زانستێکی سەربەخۆ کۆمەڵێک زانست و بەشی تری لێدەبێتەوە وە معلومە لە زانکۆکان بەشێکی تایبەت هەیە کەوا [قسم العقیدة] یە من ناچمە نێو ووردەکاری ئەو علمە باس کردنی، چونکە ئەوکات پێویستە بەقەبارەی مجلد لەسەری بدوێین. ئەوەی هەیە پێویستە عقیدەیەکی سلیم واتە: دوور لە کوفر و شرک و بیدعەمان هەبێت. من خۆم قسەی لەسەرناکەم چونکە ئەوکات دەڵێن ئەوە ڕەئی خۆیەتی، بەڵکو من ڕێگای گەیشتن بەو علمە لەڕێگەی نامیلکەو کتوبە آعتقادیەکانی خۆیان بەئێوە پیشان دەدەم واتە تۆ ڕاستەوخۆ خۆت دەچیتە سەر ناوەڕۆکی باس وە باشترین کەسەکان بۆئەوەی ببنە مامۆستات سەلەفی ئوممەتن کە پێکدێت: لە هاوەڵان و تابعین و آتباعیان.

**بۆنمونە:** لە آثرێکی صحیح کەوا ئیمامی ئەبوداود لە کتاب السنة بەسەنەدی صحیح لە هاوەڵی بەڕێز عبدالله بن عمر هێناویەتی: کاتێک دووتابعی بەڕێز لە مەوسومی حەج چاویان پێدەکەوێت و پرسیاری دەربارەی کەسانێک لێدەکەن کەوا ڕەفزی  قەدەر دەکەن، آبن عمر پێی فەرموون: ئەگەر بەوان گەیشتن پێیان بڵێن: کەوا ئەوان لەمن بەریئن وە منیش لەوان بەریئم. وە دواتر آثرێکی تری هێناوە ئیمامی ئەبو داود هەر لە آبن عمر، کەوا هاوڕێیەکی لەشام هەبوو لەئەحواڵی یەکیان دەپرسی عبدالله نامەیەکی بۆ نوسی و پێی گووت: ووریابە بەهیچ جۆرێک لەحاڵم نەپرسیت، چونکە پێم گەیشتووە کەتۆ قسە لەسەر قەدەر دەکەیت من گوێم لە رسول الله صلى الله عليه وسلم بوو دەیگووت کەسانێک پەیدا دەبن کەوا بڕوا

بە قەدەر ناکەن. ( دەڵێم: سەنەدی مقالی لەسەرە ئەبوداود لە سنن لە (کتاب السنة ) هێناویەتی.

بۆچی ئەو دوو نمونەم هێناوە؟ لەوەڵامدا:

مەسئەلەی قەدەر یەکێکە لە مسائیلە گرنگەکان، وە یەکێکە لە ئەرکانی ئیمان وەک معلومە ئەرکانی ئیمان شەشە کۆتاییەکەی بڕوابوونە بە قەدەری اللە عز وجل خێر و شەڕی. واتە پەیوەستە بە عقیدەوە بابەتێکی اعتقادیە وە سەلەف لە هاوەڵان و تابعین و اتباعیان بە کۆدەنگی لەسەر ئەوباسە قسەیان کردوە بە ئیقرار کردن لێی، وە لەکتوبە عقیدەیی و نامیلکە آعتقادیەکاندا هێناویانە و دانیان پێدا ناوە وە ئیجماعی ئەهلی سوننەی سەلەفی صالح لەسەر ئەو باسە نەقڵ دەکەن. وە من نامەوێت هەرچی کتوبی عقیدەیی هەیە لەسەلەف و لەخەلەف لێرەدا ئاماژەی پێ بدەم وە باسی بکەم، هەروەها باس نەکردنی هەندێ کتێب واتایی ئەوە نیە گرنگ نەبن بەڵام ئەوەیان کافیە، وە شتێکی تر من ناچمە نێو ووردەکاری ئەوەی کێ یەکەم کتابی لەسەر آصولي اعتقاد نوسیوە، کتێبێک هەیە کەوا کۆمەڵێک نامیلکەیی عقیدەی زۆر باشی تێدایە هەم لەسەلەف وە هەمیش لەخەلەف، بەناوی: [ الدليل جامع المفيد إلى متون عقيدة والتوحيد] لەنێویدا هەموو متنەکان مەخوێننەوە ئەوەی پێویستە و لەسەر ڕێچکەی ئەوائل نوسراوە لەسەلەف و خەلەف.

**لەسەلەف:**

(آصول السنةی الحمیدی، شرح السنة للمزني، آصول السنة أحمد بن حنبل، عقیدة الرازیین أبي زرعة وابو حاتم الرازیان و ابن ابي حاتم الرازی، صریح السنة للامام ابن جریر

الطبري، عقيدة ابن أبي زيد القيرواني، عقيدة السلف أصحاب الحديث للصابوني. وەيان لەو کتێبە زۆر چاکتر و باشتر هەیە ئەویش [جامع ی آل حمدان] کە هەرچی مەتن و کتێبی پووختی اعتقادی سەلەفە تێیدا کۆکردتەوە بۆیە بێ خەم هەموو یان بخوێننەوە. وە نامیلکەی تر هەن کەوا لەنێو ئەوکتێبە نیە ئەوانیش گرنگن، لەوانە:

(الشرح السنة للبربهاري، نامیلکەیەکی گرنگە وە دە لاپەڕێک دەبێت شتی زۆر بەسوودی تێدایە.)

لەنێو کتێبەکانی فەرموودە کتێبی عەقیدەیی تێدایە، وەك:

(کتاب التوحيد لە صحيح البخاري، الآعتصام بالسنة لە صحيح مسلم، وەیەکەم کتێبی صحيح مسلم کتاب الإمان وە القدر، کتاب السنة لە نێو سنن ابي داود . وە لە سنن الترمذي أبواب الإمان هەیە. کۆمەڵێکی زۆر تر نامیلکەو اعتقادی سەلەف هەیە بەڵام ئەوانە کافیە چونکە باسەکان هەموویان پێکەوە گرێدراون تەنیا هەندێکی لەهەندێکی تر کەم و زیادی هەیە. ئەوانە نامیلکە بوون، کتوبی مجلدی گەورەیی عقیدەیی هەیە، وەك:

(السنة ی عبدالله ی کوڕی ئیمام أحمد، السنة ی پێشەوا الحرب الکرمان کەوا ئیجماعی اعتقادی سەلەفە تابڵێ گرنگە، وە السنة لأبي بکر الخلال کە کتێبێکی دوو بەرگی گەورەیە وە یەکێکە لەکتێبە گرنگەکان، خلق الأفعال العباد للبخاري، الرد علي الجهمية ی ئیمام ئەحمەد، الرد على الجهمية الدارمي، السنة لآبن أبي زمنين کە کتێبێکی یەك بەرگی گەورەیە هەموو لایەنەکانی عەقیدەی سەلەف بە سەنەد نەقڵ دەکات، وە إبانة الصغرى والکبرى لابن بطة العکبري، الشريعة للآجري کتێبێکی گەورە و گرنگی عەقیدەییە، کتاب الوحيدی ابن

منده، وه دواتر ذم الكلام وأهله للهروي، وه دواتر شرح آصول آعتقاد أهل السنة والجماعة للألكائي. هەروەها کتێبی تایبەت به الأسماء والصفات، وەکو: (النزول للدارقطني، رؤية الله للدارقطني، التوحيد لإبن خزيمة.

## دووەم: قورئان و زانستەکانی:

پێش چوونە نێو وردەکاری کاتێک گووترا [قورئان] بەتەنها ئەوا تەنیا خوودی کتێبی قورئانی پیرۆز دەگرێتەوە بەڵام کە دەگووترێت: [علوم القرآن] یان [زانستی قورئان] ئەوا کۆمەڵێک زانستی تری نێو ئەم کتێبە دەگرێتەوە، هەر هەموویان بۆ خزمەتی قورئانە یاخوود بۆ تێگەیشتنە لە قورئانی پیرۆز بەو شێوەی کەوا هاتووە.

علم القرآن یان زانستی قورئان پێکدێت لەمانەی خوارەوە:

١- التفسير یان تەفسیر.

٢- التجويد، جوان خوێندنەوەی قورئان.

٣- الناسخ والمنسوخ.

٤- أسباب النزول.

٥- المحكمات والمتشابهات.

## ١- التفسير يان تەفسير:

یەکێکە لە گرنگترین بەشەکانی نێو زانستی قورئان کە پێویستە لەسەر موسڵمان بیزانیت وە هەوڵی بۆ بدات، تەفسیریش دەیەها جۆر و ڕێگاو شێوازی هەیە، بەر لە هەموو شت ئاشناتان دەکەم بەکتێبێک پێش ئەوەی بچنە نێو تەفسیر پێویستە بیخوێننەوە ئەویش بریتی یە لە: [مقدمة في آصول التفسير لآبن تيمية بەشەرحەوە]. کتێبێکە هەرزانە و لەهەموو شوێن دەست دەکەوێت وە پەیدا دەبێت هەموو ئەو شتانەتان پێدەڵێ لەسەر تەفسیر کە پێویستە بیزانن، وە بەهۆی خوێندنەوەی ئەو کتێبە وەک ئەوە دەبێت تۆ چرایەک بگریتە دەست و بەڕێگادا بڕۆیت چونکە من دەزانم چ شتێکی گرنگی تایبەت بەو علمەی تێدایە وە هەر آبن تیمیە قسە لەسەر تفسیرەکان دەکات وە باشترین تەفسیریش دیاری دەکات کە بریتیە لە تەفسیری [تفسير الطبري کە خاوەنەکەی آبن جرير يان أبو جعفر الطبري یە]، تەفسیرەکە اسنادا لە هاوەڵان و تابعین و اتباعي تابعینە، بە بڵند ترین سەنەد وە ڕاسترینیان نەك بڵێین هەمووی ئەوەی تێیدا هاتووە هەمووی ڕاستە بەڵام بەرامبەر ئەوانی تر لەپێشترە. هەروەها [تفسير القرآن العظيم آبن أبي حاتم الرازی] کەوا هاوشانی تەفسیری ابن جریر بێوینەیە، وە هەر لەسەر تەفسیری طبري [مختصر تفسير الطبري] هەیە کەوا تحقیقەکەی عبدالقادر الأرناؤوت کردوویەتی. بۆچی دەڵێم ئەو؟ چونکە سێ کتێبی زۆر گرنگی لەگەڵ تێکەڵ کردووە، ئەوانیش: اسباب النزول يان مختار الصحاح ڕاسترین اسباب النزول کەوا لە یەکێک لەعلومەکانی نێو قورئانە، وە فضائل القرآن لآبن كثير الدمشقي الشافعي تێدا بەکار هێناوە. دەمەوێ تیشک بخەنە سەر ئەوەی ئەم کتێبە واتە (فضائل القرآن) کە خاوەنەکەی ابن كثير ە کتێبێکی زۆر زۆر گرنکە بۆ تێگەیشتن لە سەرەتاو کۆتایی ئەو کتێبەی کە قورئانە، وە ئەو قیرائاتانەی ئێستا مشهورە وە سەرەتاو کۆتایی نوسینەوەی قورئان. بۆیە گرنکە ئەویش وەك

بەشێک لە زانستەکانی نێو قورئان بخوێندرێت وەخۆمانی لێ شارەزا بکەین. وە ئەگەر ئەوانەی تەفسیری ترمان هەیە کەوا البغوي نوسیویەتی وە لەمتأخرین یەکێک لە باشترین و هەڵبژێر دراوترین تەفسیرەکانی بریتیە لە تەفسیری: [تەفسیری ابن کثیر] ئەوەی گرنگە ئەو تەفسیرە بەکوردی هەیە وە مختصري هەیە، یەکێک لەو مختصرانە احمد شاکر کردوویەتی گرنگە وە بەعەرەبیە، ئەوەی گرنگە تەفسیری آبن کثیر لەسەرەتادا تەفسیری قورئان بەقورئان دەکات، کەوا زانایان دەڵێن باشەرین تەفسیر تەفسیری قورئان بەقورئانە، دواتر ابن کثیر لە تەفسیرەکەی اعتمادی زۆری خستۆتەسەر هەردوو گرنگترین و باشترین تەفسیر ئەویش تەفسیرەکانی: [طبري و ابن أبي حاتم] واتە: ڕەئی ئەرجعی ئەو دوو تەفسیرە دەهێنێت کەئەمەش زۆر گرنگە، دواتر اسباب النزول باسدەکات هەروەها یەکێک لە گرنگیەکانی ناسخ و منسوخی تێدا ئیشارەت پێداوە، تەفسیر زۆرن بەڵام باشترینەکان ئەوانەن، هەروەها بۆ تەفسیرە کوردیەکان بەهیچ جۆرێک جائیز نیە ئاسانەکان چونکە ترجمەی قورئانە، ئەگەر کتابەکەی ابن تیمیە بخوێننەوە کە لەپێشدا باسم کرد ئەو شتەتان بۆ ڕوون دەبێتەوە. بەڵام یەکێک لەو تەفسیرانە ئەگەر دەستکاری نەکرابێت باشبوو تاڕادەیەک ئەویش (تەفسیری ڕامان)ــە، چونکە کاتی خۆی کە من خوێندمەوە تعدیلاتی تێدا نەکرا بوو.

**٢- تەجوید:**

ئەویش زانستێکە لەنێو قورئان کەوا پێویستە بۆ قوتابی زانستی شەرعی خۆی فێر بکات، تەجوید هەمووی یەک شتە بەڵام دەمەوێ یەک شتان بخە مێشکەوە ئەویش ئەوەیە ئەمڕۆ ئەم زانستە زۆر قورس کراوە، بەجۆرێک بەساڵ خەریکی دەبن لەکاتێکدا ئەوپەڕی دوومانگ

بۆی کافیە و لێی فێر دەبیت إن شاء الله. بۆیە زۆر خۆتان بەوە ماندوو مەکەن بەوەی بەساڵ بەدیار تجویدەوە بن.

## ٣- الناسخ والمنسوخ:

ئەوەیان یەکێکی ترە لە زانستەکانی نێو زانستی قورئان کە پێویستە قوتابی زانستی شەرعی بیزانێت، وە هاوەڵان وەك: ئیمامی علی و عبدالله بن عباس رضی الله عنهما زۆر پێداگریان لەفێربوونی ئەو علمە کردۆتەوە، بەجۆرێک تەنانەت ئەگەر کەسێک شارەزایی لەو علمە نەبووایە ڕێگەیان نەئەدا لەمزگەوتیش قورئان بۆ خەڵک بخوێنیت. ئەم آثارانە لەزۆرینەی زۆری کتوبەکانی وەك ناسخ و منسوخەکان والمدخل إلى سنن الکبرى للبیهقی و کۆمەڵێکی تر هاتوون، باشترین کتێب کەتایبەت بێت بەو علمە [الناسخ والمنسوخ لأبي جعفر النحاس] بەم ناونیشانە بەڵام لە کتێبخانەکان زۆر زەحمەت دەستدەکەوێت چونکە ئێستا ئەو علمە بەلانراوە وەکەس گرنگی پێنادات بۆیە دەتوانن لەڕێگەی پیدی ئێف دایبەزێنن، وە ناسخ و منسوخی ترمان هەیە کەوا (القاسم بن سلام) نووسیەتی بەڕێگای ئەبوابی فقهی، تابڵێی کتێبێکی نایابە و گرنگە زۆریش، وە [ابن جوزي] نوسیویەتی ئەویان دوای یەکەمە، وە ئیمامی قتادە و ئیمامی ابن شهاب الزهري کە دوو تابعین کتێبیان لەسەر ئەو علمە نوسیوە وە کتابەکەش بەردەستە بەپیدی ئێف.

وە ئەوانی تر واتە زانستەکانی تری وەك اسباب النزول و المحکمات والمتشابهات ئەوانیش بەشێکن لەزانستی قورئان لەسەرەوەش باسم کرد، وە ئەگەر سێرچ بکەن ئەوا دەیان کتێب

لەسەر ئەو باسە بەردەستە، بۆیەش ناچمە نێو ووردەکاری چونکە کتێبەکان زۆرینەی لەیەکەوە نزیکن وە لەبارەی اسباب النزول مختصري تفسير الطبري بەتحقيقی عبدالقادر أرناووت لەنێویدا کتێبێکی چاکی لەو زانستە بەکارهێناوە وە لباب النقول ی سیوطي تايبەتە بەو باسە.

## سێیەم: علم الحديث، زانستی فەرموودە:

کە دەگووترێت [حديث] تایبەتە بە نصی فەرموودەکانی رسول الله صلى الله عليه وسلم، بەڵام کە دەگووترێت [زانستی فەرموودە] ئەوا ئەو بەشانە دەگرێتەوە کەوا بۆ تێگەیشتن و خزمەتی خوودی حدیثةکەیە، زانستی فەرموودە پێکدێت لە زانستەکانی:

(الجرح والتعديل یاخوود علم الرجال، علل الحديث، مصطلح الحديث، الناسخ والمنسوخ الحديث، شروحات الحديث). پێش ئەو علمانە لەهەموویان گرنگتر [حِفظ الحديثة یان حفظ المتون] لەبەرکردنی فەرموودە و مەتنەکان، وەك دەڵێن [أشرف العلوم] چوونکە ئەگەر نیەتێکی پاکی تێدا بێت ئەوا سوودی دونیاو قیامەتی هەیە. دواتر ناوی ئەو کتێبانە دەهێنین بۆ ئەوەی بە پلە بەندی پێی تێپەڕن إن شاء الله. بەڵام پێش دەستپێک و چوونە نێو دونیایی ئەم علمە ئەوا پێویستە شارەزایی مێژوویی ئەم علمە بن، چونکە ئەم علمە وەك قورئان نەبوو بەڵكو دوای وەفاتی رسول و بەتایبەت دوای چینی هاوەڵان لەسەردەمی تابعین سەری هەڵدا بەشێوەی گشتی، بۆ ئەو مەبەستەش کتێبێک هەیە بەناوی [التقييد العلم للخطيب البغدادي] کتێبێکی زۆر نایابە لەو بوارە الحمد لله هەر لەسەرەتاوە لەوێدا دەستم پێکرد بۆیە بۆ تێگەیشتن لەسەرەتاکانی ئەو علمە بگەڕێنەوە بۆ ئەو کتێبە. دواتر بچنە سەر لەبەرکردن

(حفظ) ی حدیث چونکە هێندە زۆرە بەشی هەموو تەمەنت دەکات. باشترین کتێب بۆ ئەوانەی لەسەرەتادان واتە آبتدائي نە بچنە سەر [أربعين+ زوائد إبن رجب الحنبلي]. دواتر ڕاستەوخۆ بچنە سەر [عمدة الأحكام] کەوا حافظ عبدالغني المقدسي نووسیویەتی،(٤٢٠) حدیثي صحیح البخاري و صحیح المسلم ی تێدایە هەموویان فەرموودەی ئەحکامن وە بەشێوەی باب و کتاب داڕێشتوە، زۆرینەی فەرموودەکان [ متفق عليه ] لەنێوان بخاری و مسلم. من خۆم الحمد لله لەسەرەتای هەموو شت لەوێدا دەستم پێکرد تەنیا ئەوە نەبێت پێش ئەو أربعینم حفظ کرد چونکە ئەوکات لەتحقیقات و علم الرجال شارەزا نەبووم. بەڵام دەشکرێ وەک سەرەتایەک لەو چل فەرموودە دەست پێبکەن دواتر بچنە سەر عمدة الأحكام، هەرلەگەڵ حفظ پێویستە بچیتە سەر الجرح والتعديل واتە: پێناسەو ناساندنی کتیب زۆرە، لەپێش هەموویان [مقدمة الجرح والتعديل لآبن أبي حاتم الرازي] کتێبێکی گەورەیە، بەڵام تەنیا مقدمەکەی بخوێنن کەوا زۆر گرنگە هەم پێناسەی ئەو علمە و گرنگی و سەرەتایی ئەو علمە وە هەمیش ژیانی کۆمەڵێکی زۆر لەموجتەهدینی ئوممەت باسدەکا.

بەخوێندنەوەی پووختەیەک لەو زانستە تێدەگەی وە ئیمامی حاکم کتێبێکی هەیە بەناوی [معرفة علوم الحديث]، وە [ خطيب البغدادي بەناوی الكفاية] ئەو سێ کتێبە تەقریبەن پەیوەستن بەمەنهەجی سەلەف لەو بوارەدا. وە لەنێو معاصریندا کتێبێکی هەتا بڵێی باش و چاك هەیە هەم بۆ پێناسەی الجرح والتعديل هەمیش بۆ علم الرجال وە قواعید و بنەماکانی بەناوی: [ آصول الجرح والتعديل وعلم الرجال، د . نورالدين عتر ] ئەو کتێبە بخوێننەوە سوودی زۆر باشی لێدەبینن إن شاء الله، هەر لەو نێوەندەدا کۆمەڵێک کتێب هەیە کەوا پێیان دەڵێن: [مصطلح الحديث ] کە زیاتر دانراوی متأخرینە، کتێبەکان [ نخبة الفكر لآبن

حجر، الموقظة للذهبي، تدريب الراوى للسيوطي، مقدمة لآبن صلاح الشهرزوري، اختصار علوم الحديث، لآبن كثير وله شرح مهم باسم باعث الحثيث على اختصار علوم الحديث لأحمد شاكر، و منظومة البيقونية، وه فتح المغيث للسخاوي، كۆمەڵێکی تر .... هتد].

**تێبینی و خاڵێکی زۆر گرنگ لەسەر ئەو باسە:** ئەو کتێبانە هەموویان یەک باسن تەنیا هەندێکیان لەهەندێکی تر وورده‌کاری و تفاصيلاتي زیاتری تێدایە، بۆیە پێویست ناکات بەساڵ خەریکی بن وەك ئەمڕۆ بەبیانووی پێدانی ئیجازەی سەنەد هەرچی کتێبە لەو بوارە بە قوتابی داماو دەخوێنن، لەکۆتایشدا هەموویان یەک شتن وه پەیوەستن بە متأخرینەوە.

دواتر زانستێکمان هەیە کەوا پێی دەڵێن: (الناسخ والمنسوخ) للحديث ئەوەیان وەک چۆن لەقورئان هەیە لەویشدا هەیە وه پێویستە خۆمانی لێ فێر بکەین، دوو لەو کتێبانە [الناسخ والمنسوخ لآبن شاهين،الناسخ الحديث ومنسوخه لأثرم]، بۆ معلومات ئەوانە بەکتێب دەگمەن دەست دەکەون تەنیا بەپیدی ئێف وەلەو خۆم ناسخ الحديث ومنسوخه لآبن شاهينم کڕیوە، بەڵام بە ئەلکترۆنی بەئاسانی دەستدەکەوێت.

**وه یەك شت بزانن*** هەموو ئەو علمانە بەتایبەت ناسخ ومنسوخ، پەیوەستە بەهەبوونی حفظێکی باش چونکە دەبێت لەبەریان بکەیت هەم قورئان هەمیش حديث، دواتر (علم الرجال) دێ تایبەتە بەناسینی رجالی حديث وه علل الحديث، لەڕووی (زانستی عللەوە)

كۆمەڵێک كتێبی گرنگی سەلەف هەن، وەك: (العلل لعلى ابن المديني) كۆمەڵێک لە (علل أحمد برواية ابنه عبدالله أو صالح و المروذي وسؤلات ابي داود عنه وعلل الميموني عنه ) و (علل الكبير للترمذي ). هەرلەو چوار چێوە سؤلاتەكانی يحيى بن معين و احمد بن حنبل على ابن المديني وە گشتگیرترینیان كتێبی [الجرح والتعديل لآبن أبي حاتم الرازي] ئەوانە ئێستا الحمدلله هەموويان كۆكراونەتەوە كراون بە موسوعة هەم الضعفاء والمتروكين هەميش سؤلات وە هەميش علل، ولله الحمد.

هەروەها پێویستە دوای قورئان فێری ئەوەبین یاخوود ژياننامەی پێغەمبەرەكەمان صلى الله عليه وسلم بزانین، بۆ ئەوەش لەكتێبەكانی (سيرأعلام النبلاء) و (البداية والنهاية) ئەوانە لە پێش دەستپێكی ژيانی هاوەڵان كتابێكی مجلديان تايبەت كردووە بە ژيانی پێغەمبەر، وە كتێبی تايبەت وەك: سير النبي لآبن هشام وە هەروەها لە كتوبەكانی حديث، وەك: صحيح البخاري، صحيح المسلم، سنن الترمذي، ئەوا چەند كتاب و بابێكيان تايبەت كردووە بە غزوات و علاماتی النبوة و باسی تر. وە لەنێو كتێبە كورديەكان [باشترين كتێب لەولايەنە كتابەكەی محمد مەلا فايقە] كەوا سێ بەرگە و بگرە لەزۆرێک لەكتێبە عەرەبيەكان باشترە تەنيا ئەگەر خوێندتانەوە سەيری هامشەكان بكەن، واتە: سەرچاوەكەی چونكە هەندێ باس و خواسی لاواز هەن كەوا هێناويەتی واتە ئەو بەدرێژی هەموو ڕيوايەت و باسەكانی لەسەرهێناوە بيخوێننەوە سوودی دەبێت إن شاءالله.

**(خوێندنەوەی سیرەی سلف پێویستە)** لەپێش هەموو شت بۆ طالب العلم پێویستە بە صیغەی ئەمر کەوا شارەزابێت بەسیرەی سلف واتە ژیاننامەی سلف وەک: [صحابە و تابعین و اتباعی تابعین] سێ باشترین سەدەی هەموو ئوممەت بەهەموو شێوەیەك لەسەر طالب الحدیث واجبە کەوا ئەم شتانە بزانێت صحابی بناسێت تابعی بناسێت وە اتباعیان هەر خودی شارەزابوون لەم سیرەی سلف پێیدەڵێن: [علم الرجال] وە [علم الجرح والتعدیل] واتە: لەڕێگای ئەو شتە دەزانیت. بۆ نموونە لە (طبقات الکبری) ی آبن سعد هەم ژیانی باس دەکا وە هەمیش لایەنی حفظ و علم ی و توثیقی، شارەزابوون لە سیرەی سلف واتای شارەزا بوونیشە لە [تأریخ]، چونکە کاتێ ژیانی حسن البصری دەخوێنیت تێ دەگەی چ شتێ لەسەردەمی ئەو ڕوویداوە وە خلیفەو سەردەمەکەش بۆنمونە تێدەگەی [عمر بن عبدالعزیز] ملتزم بووە بە ئامۆژگاری ئەو یان [سعید بن المسیب] یان [عروة بن الزبیر ]، لەگەڵ خوێندنەوەی سیرەی هەریەکێکیان ئەوەشت بۆ دەردەچێت کەوا هاوتەمەکانی ئەوان کێن بۆنمونە تێدەگەی [ئیمامی مالك و الأوزاعی و سفیان الثوری ] هاوتەمەن بوونە، وەتێدەگەی ئەوزاعی شامیە و مالك مدنیە و سفیان کوفیە، بەپووختی شارەزابوون لێ [چەندان علمە] کە لەسەرەوە باسم کرد، باشترین کتێبەکان لەو لایەنە ئەوەی من خۆم خوێندوومە.

**لەکتێبە پێشینەیەکان** (طبقاتی ابن سعد) و (تاریخ الخطیب) و (حلیة الأولیاء)، وە (سیر أعلام النبلاء) هەندێ تایبەتمەندی تێدایە لەوانی تر نیە. ڕوونکردنەوەیەك لەسەری:

هەندێ خاڵی زۆر گرنگ هەیە پێویستە لەسەری بزانرێت، بەتایبەت( عەوام ) یان ( مبتديء) ئەو کتێبە گشتگیرە : واتە ژیانی پێغەمبەر و هاوەڵان و تابعین و أتباعی تابعین و سەلەف

هەمووی لە خۆ دەگرێت، ئەوەی گرنگە خوێنەر بیزانێت ئەو کتێبە هەڵگری ناوەکەی نیە چونکە (پاڵفتە) نەکراوە بەڵکو هەرچی مبتدع و گومڕا و زەندیق هەیە تێیدایە واتە جێگای کراوەتەوە، بۆیە پێویستە لەو لایەنە وریابیت چونکە لەلایەن نووسەر تساهلاتی زۆریان لەسەر کراوە لەبازنەی (بیانوو ) هێنانەوە بۆیان. وە ئەو کتێبە کۆکەرەوە کتێبەکانی تری وەك ( ابن سعد و تاریخي خطیب و حلیەیی ابو نعیم و هتد .. ). لەڕووی سەنەدەوە کە گرنگترین لایەنە: نووسەر هەوڵی داوە زۆرترین ڕیوایەت لەسەر ژیانی هەر یەکێکیان کۆبکاتەوە، بۆیە زۆر بەسەر هات و باسی (عجائب و غرائب و منكر) ی تێدایە، هەندێکی خۆی تحقیقی کردیە بەڵام لەزۆرینەی بێدەنگ بووە، بۆیە پێویستە لەکاتی خوێندنەوەی بەووردی سەیری تحقیقەکەی بکرێت، بۆ ئەوەش (شعیب الأرناؤوت) تحقیقی کردووە، هەروەها جگە لە لایەنی مێژوویی و سیرەیی ، نووسەر لایەنی الجرح والتعدیل ی تێدا بەکارهێناوە، بۆنمونە: کاتێ باسی ژیانی (سفیان الثوري) دەکات ئەقوالی ئەئمەی الجرح والتعدیل ی لەسەر نەقڵ کردووە، بۆنمونە فلان زانا دەڵێ: سفیان أمیر المؤمنین في الحدیث یان ئەگەر یەکێکیان جرح کرابێ وەك ابن لهیعة بەنمونە، بەڵام لێرەدا بەکورتیە. وە جگە لەوەش نووسەر تاڕادەیەك تساهلاتی زۆری تێدایە لەسەر (الجرح) واتە کەمتر ئەو لایەنە دەگوازێتەوە بەبەراورد بە ( التعدیل ) بۆنمونە لە کتێبی ( من تكلم فیه وهو موثوق ) ئەگەر چوار ئیمام جرحی ڕاویەکیان کردبێ یەکێ توثیق دەڵێ: (وثقە) قال فلان لابأس بە....

لەڕووی سەرچاوە (مصدر): ئەو کتێبە نابێتە سەرچاوە بۆ بابەتی هەستیار چونکە لەڕووی سەنەدەوە زۆر دوورە بەڵکو دەبێ هەر باسێکی ناوی بۆ سەرچاوە ئەصلیەکە بگەڕێندرێتەوە، ئینجا تحقیقی لەسەر بکرێ دوای تحقیق ئەوکات بڕیار دەدرێ. بۆنمونە : آثرێک هاتووە لە

هاوەڵێک لەبابی عەقیدە ، تۆ ناتوانی بێ بڵێی ئیمامی عمر وای فەرمووە بنوسی لە (سير أعلام النبلاء ) هاتووە، بەڵکو پێویستە سەرچاوەی ئەو قەولە لەچ کتێبێکی ترە بۆنمونە: لە تأريخ ی خطيب البغدادي هاتووە، ئینجا دەگەڕێینەوە بۆ ئەو کتێبە سەیری سەنەدەکان دەکرێ بەو شێوەیە.

بۆئەمەش محققەکان ئەو زەحمەتیەیان لەسەر خوێنەر نەهێشتووە چونکە تخریجی هەموو ئەقوالەکانیان کردووە. **لەوەڵامدا:** من هەمیشە لەهەوڵی ئەوە دا بووم کەوا لەهەموو شتێک بزانم وەفێر بم، وەگوومانم نیە زۆرێکی تر هەمان حەزیان هەیە وە ئەگەر ئەو حەزەمان هەبێت ئەبێت زۆر ترین جهد و تێکۆشان بکەین وە زۆر ترین قوربانی بدەین، چونکە علمێک نیە بڵێی ساڵێک یان دوای دووساڵ تەواو دەبێت. بۆنموونە ئەگەر کەسێک هیچ نەزانێت لە قواعدی عەرەبی، بە جهد و تێکۆشانی دووساڵ فێر دەبێت و پێویستی زیاتری پێ نابێت یان ئەگەر هیچ لە تەجوید نەزانێت ئەوا بە جهدی کەمتر لەساڵێک تەواوی دەکاو شارەزا دەبێت، بەڵام علم الحديث یان قورئان علمێک نیە بڵێی بەساڵێک یان دوو تەواوی دەکەیت و دەگەیتە بنبەستی کۆتایی، وەکو سەلەف تاوەکو کۆتایی تەمەنیان هەر خەریکی ئەم علمە دەبوون. وە لەلایەکی تر ئەگەر بتەوێت تەنها لایەنێک هەڵبژێرێت ئەوا لایەنەکانی تر تووشی جهل دەبیت، وەك ئەگەر ڕووبکەیتە قرائات و تفسير بەڵام آعتقادی سەلەف بەلاوە بنێیت یان ڕووبکەیتە حديث قورئان و عقیدە بەلاوە بنێیت.

## دابەش کردنی کاتەکان بۆ علم:

بەرنامەیەکی ڕۆژانە کەوا هەموو علمەکان کۆدەکاتەوە، بەڵام لەوکاتەی چاو دەکەیتەوە لەخەو هەتا چاو دادەخەیت بۆ خەو دەبێت لەسەری بیت. دوو علمی ئەساسی واتە: قورئان و حدیث دەبێت بکەیتە هاوڕێی بەردەوامی ڕۆژانەت، واتە ئەوانە هەموو ڕۆژ دەبێت هەندێک لەو هەندێکی تر بخوێنیت چۆن؟

لەسەرەتایی بەیان قورئان، ڕۆژانە حفظِ قورئان واتە تۆ گەر لەئیش بیت یان هەر شوێن و جێگایەکی تر بەپێی ئەو مجالەی کە هەتە هەتاوەکو بانگی نیوەڕۆ خەریکی حفظِ، لەو کاتەدا دابەشی دەکەیت ئایا چوارئایەت یان دەئایەتت پێ لەبەر دەکرێت، دوای تەواوبوونی حِفظ بەساڵێک یان کەمتر یان زیاتر تۆ دەبێت لەسەر هەمان بەرنامە بڕۆیت، بەڵام لە مراجعەدا کاتت بۆ دەگەڕێتەوە بۆیە دەتوانی ڕۆژانە لەوکاتەی کە بۆ قورئان یان مراجعە داتناوە تجوید یان اسباب النزول یان مختصري تفسیرێک بخوێنێت، ئەمە تایبەتە بوو بەقورئان وە تەنها لەبەیانی تاوەکو نیوەڕۆ.

دواتر هەتا مغریب خەریکی حِفظِ حدیث دەبیت، ڕۆژانە بەردەوام ، لەسەرەتا دوو حدیث دوای مانگێگ دوو بیکە پێنج دوای شەش مانگ بیکە دە دوای ساڵێک بیکە بیست دوای دوو و سێ بیکە سی و وەچل ئەم شتە ئاسان دەبێت بە مروری زەمەن،

لەسەرەتا دا کتابی[ عمدة الأحکام ] کە ٤٢٠ حدیثة هەڵبژێر دراوی بوخاری و موسلیم بێ دووبارە، ئەگەر ڕۆژانە دوو حدیث لەبەر بکەیت ئەوا بە ٢٠٠ ڕۆژ هەموو کتابەکە تەواو دەکەیت. ئەگەر پێنج حدیث بێت ئەوا بە ٨٤ ڕۆژ هەمووی تەواو دەکەیت. بەپێی مجال و وە

توانای خۆت. بەڵام ئەوەش نابێتە ئەوەی بڵێی هێندە مجالم نیە بەڵکو دەبێت مجال بۆ خۆت دروست بکەیت کە دواتر ڕوونی دەکەمەوە.

واتە تۆ لەسەرەتا هەتا ساڵێک ئەو توانایەت هەیە دواتر وای لێدێ ڕۆژانە بیست هەتا چل حدیث حِفظ دەکەیت لەوماوەدا، واتە تاوەکو شەو ئەمە دوو بەرنامەی هەمیشەییتە کە دوای ساڵانێک بەرووبوومەی هەزاران حدیث و حِفظی قورئان تجوید و تفسیر هەمووی فێردەبیت وە دەچێتە نێو سینگت.

دواتر شەو دەمێنێت لەشەووەوە هەتا ئەوکاتەی دەخەویت پێویستە: بنچینەکانی ئەو دووعلمە فێر بیت، چونکە ئەگەر حافظی هەموو حدیثەکان بیت ئەگەر شارەزایی علمەکەی نەبیت وەک نابینا وایت هیچت پێ ناگوترێت. بەڵام لەو کاتەدا زیاتر شتەکان خوێندنەوەیە نەك حفظ، پێویستە کە تۆ لەوحاڵەدا شارەزایی مصطلحاتی حدیثی دەست بکەیت بە سیرەی سەلەف لەهاوەڵان و تابعین و اتباعیان وە قوتابییەکانیان.

چونکە ئەگەر تۆ شارەزایی ژیانی هاوەڵێک بیت دەزانیت قوتابییەکانی کێن. **بۆنمونە:** لەسەندێک دا تەنها نوسراوە عن عبدالله، ابن مسعودە یان ابن عمرە یان ابن عباس یان ابن الزبیرە یان ابن عمرو ە ئەوانە هەرمووی عبداللەن، بەڵام ئەگەر ژیان و سیرەی ابن مسعودت خوێند بێت دەزانیت لەسییەکانی هجری وەفاتی کردوە علقمەو عبدالرحمن ابن مسعودە سالم و نافع ابن عمرە سعید بن جبیر و مجاهد و عکرمەو ئەوانی تر ابن عباسە دواتر بەخوێندنەوەی ژیانی تابعین شارەزایی ئەوە دەبیت، ئایا حسن گوێی لە عمر بوە یان أبو

عثمان گوێی له ابوبکر بوه یان ابن المسيب گوێی له عثمان بوه ، بەم جۆره تۆ شارەزایی حدیثةكان ئەبیت تەنانەت ئەگەر حدیثةکەشت نەخوێندبێت دەزانیت ئایا صحیحة یان نا بەتێگەیشتن له سیرەی سەلەف، بەڵام زانینەکە بۆ إرسال و إنقطاعة چونکه هەتا الجرح والتعدیل نەخوێنێت ناتوانیت بەتەواوی حوکم لەسەر راوی و رجالی حدیث بدەیت. تۆ رۆژانه ژیانی هاوەڵێک یان تابعیەک مەرج نیه بەیەک رۆژ ژیانێکی کامل بخوێنێت، **بۆنمونه:** سیرەی عمر دەیان لاپەڕە ژیانی سفیان الثوري سی لاپەڕە ژیانی الشافعي نزیکەی سەد لاپەڕە خۆ ناکرێت بەیەک رۆژ تەواوی کەیت چونکه سوودت پێناکەیەنێت بۆیە ووردە ووردە ، تاوەکو دوای ساڵێک بەرهەمی دەبێتە شارەزابوون لەژیانی دەیان ئیمام و پێشەوا ئەمه شەوان نیو کاتژمێر یان کاتژمێرێکی بۆتەرخان بکە، شەو ماوە بۆیە ناکرێت عقیدەش بەلاوە بنێیت بۆیە شەوان نیو کتژمێر بۆ خوێندنەوەی کتوبێکی عقیدەیی تەرخان دەکەیت.

**بۆنمونه:** السنةی عبدالله که دوومجلده شەوان نیوکاتژمێرێک بیخوێنه ئینجا به چوار مانگ یان هەشت یان ساڵێک تەواوی دەکەیت کەوا جمعی اعتقادی سەلەف لەو کتابه بەسەنەد کۆبۆتەوە. کەواتە سەیربکەن بەیەک ساڵ ئەگەر لەسەر ئەو بەرنامە برۆیت چ علمێک کودەکەیتەوەو فێر دەبیت، بەڵام دەبێت قوربانی بدەیت! نابێت بەکەیفی خۆت بگەڕێی وە بچیتە میوانداری یان دیوەخان خۆش کەیت یان سەفرە بکەیت، ئەمانه هەمووی بکه بەڵام,زۆر زۆر کەمی بکەوە. مەڵێن ئیشمان هەیە و مجال نیە واللەی هەبووە کارتۆن و شلیفی لەسەر شان بووە لەڕێگادا قورئان یان حدیثی حِفظ کردووە، تۆ که تێکەڵ بوویت بەتۆ بێت هەموو ژیانت تەنیا خەریکی علم بیت. بەڵام یەک شت بکەن نابێت پەلەتان بێت نابێت بڵێن وا تەمەنمان رۆیشت نابێت بڵێیت بەساڵێک هەمووشت بزانم علم پێویستە زۆر لەسەر خۆ

بیت وە پەلەی لێ نەکەیت، وەئەو بەرنامە بۆ کەسانێکی زۆر تایبەتە کەوا ئامادەن تێبکۆشن في سبيلي علم و فێر بوون کە دەزانن ڕێگای بەهەشتە إن شاء الله. بۆیە ئەم بەرنامە کۆکردنەوەی هەمووعلمەکانە لەیەک ڕۆژ و یەک کات إن شاء الله سوودی دەبێت بۆ ئەوانەی کە لەسەری دەڕۆن.

ولله الحمد والمنة بۆ شاهێدی ئەو بەرنامەی کەدامناوە، یەکێک لە (طالب العلم ) ـەکان کە برایەك بوو دوای ئەوەی ڕێگاکانم بۆ ڕوون کردەوە و هانم دا کەوا پێش هەموو شت ئەگەر توانای هەیە قورئان لەبەر بکات، توانا و ئاستی لەبەر کردنی خۆی پێگووتم دوای ساڵێك کە دابڕا پەیوەندی پێوە کردم، گووتی: الحمد لله (ئێستا حافظِ قورئانم، وە ٦٠٠ فەرموودەشم لەبەر کردووە و ئیجازەی هەندێ قیراِئاتیشم وەرگرتوە ) والله على ما أقول وكيل.

بەڕاستی ئەوە بۆ ئێمە هەموو دونیا دێنێت وە بۆ ئێوەش هاندانە تاوەکو بزانن کە گەر خۆتان مەیلتان لەسەری بێت و هەوڵ و ماندوو بوونی بۆ بدەن دڵنیابن هەموو شتێک بەدەست دێ، دەبێ چ هەستی لە چێژی علم و دیراسەی قورئان خۆشتر هەبێ واللەی لەدونیا دا دوای چێژی ئیمان هیچ هەستێک وەك ئەوە نیە و نابێ. بەڵام لەسەرووی هەموو ئەوانەوە پێویستەو دەبێت کەوا هەموو ئەو زانستانە بە سلسلە و پلەبەندی بێت، وە دەبێ لای مامۆستایەك بێت کەوا ( ثقة ) بێت، واتە: متمانە پێکراو بێت وە بیرو باوەڕێکی سەلیمی هەبێت هەروەها ( حافظ ) بێت، واتە: زانستی لەناخی هەڵگرتبێت وە بلفعل و بەفعلیش شارەزابێت. چونکە

ناکرێ وە نەبووە تۆ بێ هیچ کەس و لایەنێک بگەیتە لووتکەی علم وە گەر هەوڵیش بدەی ناتوانی کامل بیت ئیللا کەم و کوڕیت دەبێت.